# ئەمن و ئاسایش
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

## کوردستان وەك نمونە

رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا



مەلا عەبدوڵڵا شێرکاوەیی

2015
چاپی یەکەم - کوردستان

# ئەمن و ئاسایش
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

## کوردستان وەك نمونە

مەلا عەبدوڵڵا شێرکاوەیی

هەولێر _ کوردستان
٢٠١٥

* ناوی کتێب : ئەمن و ئاسایش لە روانگەی ئیسلامەوە.

* ناوی نووسەر : مەلا عەبدوللا شێرکاوەیی.

* نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠١٥

* دیزاینی بەرگ : دیاری جنید

* تایپ و هەڵەچنی: دایکی شاگول

* چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات_ هەولێر

* تیراژ : ١٠٠٠ دانە

* تێل و ئیمەیل: ( ٠٧٥٠٤٦٣٢٧١٥ )_( Sherkaway٨٢@gmail.com )

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ٥٩١ ) ی ساڵی ( ٢٠١٤ )ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

**قـال تعـالى:**

**وَإِذْ قَـالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آَمِنًـا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ..**

البقرة: ١٢٦

**قـال تعـالى:**

**وَقُلْ رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلًـا مُبَـارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ**

المؤمنون: ٢٩

صدق الله العظيم

# پێشکەشە

# بە:

* گیانی ئەو پێغەمبەرە نازیزەی هەمیشە ئارامی مرۆڤایەتی ئامانج بووە.
* ئەوانەی بەهەستێکی دڵسۆزانە تامەزرۆی سەقامگیریو هێمنیو کوردستانن.
* ئەوانەی هەستی پارێزگاری نەتەوەو نیشتمان، بە بەشێك لە دینداری خۆیان دادەنێن.
* ئەو زانا پایەدارانەی، کە شەونخونیان لە پێناو ئارامی رۆحو خاكو خەڵك کردووە.
* رۆحی دایکی هەمیشە لەیادو رەحمەتیم، باوکی بەرێزم کە خەمخۆرانە پێیان گەیاندم.
* خوشكو برایەکانم، شاگوڵ خانی کچم کە بۆ من مایەی ئارامین.

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**الحمد لله ربّ العالمين والصّلاة والسّلام على سيّدنا محمد وعلى آله واصحابه الطّيّبين الطاهرين ومَن تبعهم بإحسان الى يوم الدين..**

ئایینی ئیسلام بایەخی زۆری بە پرسی ئاسایش و ئارامی داوە، لەبەر ئەوە خوای گەورە لە قورئاندا ئەو راستیە وەبیر مرۆڤ دێنێتەوە، کە پێویستە بەردەوام خواپەرستی ئەو خوایە بکەن، کە لە برسیەتی و ترس و بیم رزگاری کردووین.

چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەیە ئاماژە بەوە دەکا، کە پاراستنی ئەمن و ئارامی خەڵك و وڵات، ئەرکێکی پێویستەو دەکەوێتە سەر شانی موسڵمانانەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لە پەیاننامەی مەدینە لەچەند بڕگەیەکدا ئەوەی دووپات کردەوە، کە پێویستە هەردوولا (موسڵمان و ناموسڵمان) بایەخ بە سەقامگیری بدەن و بیپارێزن.

وێڕای ئەمەش ئایینی ئیسلام ئایینی ئاشتی و ئاوەدانی و هێمنی و ئارامی و خۆشبەختی و میانڕەوی و بەرپاکردنی دادو یەکسانی و گەشەو پێگەیشتنە، ئایینی برایەتی و تەبایی و لێبوردەیی و رێزو بەهای ئینسانیە، هەمیشە جەخت لەوە دەکاتەوە، پێویستە مرۆڤەکان ببنە مایەی خێر بۆ خۆیان و دەوروبەرو ژین و ژیانیان، ئیسلام قەت نایەوێ مرۆڤ بەلای توندتیژی و نارێکی و کاری چەپەڵ و بڵاوکردنەوەی خراپ و هەنگاوی دژ بە ئیسانیەت بڕوا، بۆیەش دژی بیری توندڕەوی و تیرهاب و تیرۆرە، سەرەڕای هەموو ئەوانە دژی هەر کارو هەنگاوێکە ببێتە هۆی شێواندنی ژیانی ئاسایی خەڵك و شڵەژانی کۆمەڵایەتیەوە.

تەنانەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی باس لەوە دەکا، کە دروست نیە مرۆڤ بە بێ هۆ لانەی چۆلەکەیەکیش تێك بدات و ئارامی بشێوێنێ، چ جای تێکدان و شێواندنی باری ئەمنی شارێك، یان نەتەوەو وڵاتێك!

لە حاڵێك قسە دەکەین و دەنووسین، کە ئێستا گروپی داعش بەرۆکی کوردو کوردستانی گرتووەو دەیەوێ لایەنی ئەمنی و ئابووری و ئاوەدانیمان لێ بشێوێنێ، بۆیە دەبێ هەموان هەست بە مەترسی ئەمان و تێکچوونی ئاسایش بکەین، لەهەمان کات دەبێ ئەو راستیەش بزانین، کە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان ئەرکێکی ئایینیە بەر لەوەی نیشتمانی بێت، دەبێ پارێزگاری لێ بکەین و بەو پەڕی دڵسۆزیەوە بایەخی پێ بدەین.

لەبەر ئەوە ئەم نووسینە (ئەمن و ئاسایش لەروانگەی ئیسلامەوە) کە لەلایەن برای بەڕێزمان مامۆستا مەلا عەبدوڵلا شێرکاوەیی ئامادە کراوە، سەرەڕای ئەوەی پرۆژەیەکی گرنگ و پێویستە لەم بارودۆخەدا، لەهەمان کاتیشدا بۆ قۆناغی ئێستا هەبوونی ئەو هۆشیارەیە پێویستی بە کار بۆ کردن و نووسین و خیتابی پتر هەیە، هەر چەندە بە شایەتمانی هەموو لایەك زانایانی ئاینی کوردستان رۆڵی کاراو بەرچاویان هەبووە لە سەقامگیری ئەمن و ئاسایش لە هەرێمەکەمان و، وشیار کردنەوەی هاوڵاتیان لەم پرسە گرنگەدا، بەڵام ئەرکی هەموو تاکێکی کوردە خەم لەو پرسە بخواو خۆی لێ نەدزێتەوە، چونکە گەلێ جار هەست بە بۆشایەکی گەورە لەو بوارەوە دەکرێ، خەمخۆری بۆ ئەو هەنگاوە کە پەیوەستە بە ژیانی هەموانەوە، دەچێتە چوارچێوەی ئەرکێکی پیرۆزو پاداشتی زۆری دونیایی و قیامەتیەوە..

بەو هیوایەین کە ئەم نوسینەی (مامۆستا شێرکاوەیی) کەلێنێك لەم بوارە پر بکاتەوەو، زەخیرەیەکی باشیش بخاتە بەر دەستی خەمخۆرانی ئەم بوارەوە ...

**مەلا عەبدوڵلا مەلا سەعید گرتکی**

**سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان**

**٢٠١٤/١٢/٢٤**

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

بێگومان بەرقەراربوونی ئەمن و ئاسایش ڕۆڵی گەورە دەبینێت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە پاراستنی ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و نیشتیمانی، پێشڤەچوونی کۆمەڵگاو پەرە پێدانی لەڕووی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسیەوە وابەستەیە بە بوونی ئەمن و ئاسایش، کە یەکێکە لە گرنگترین پێداویستیەکانی ژیان و ڕەوڕەوی مروڤایەتی.

لەم سونگەوە دەبینین پەیامی ئیسلام بەگشتی پەیامی چاکەو دڵنەوایی و تەناهییە بۆ تەواوی مروڤایەتی، خوای گەورە دەفەرمویت: (**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ**) الأنبياء: ١٠٧، موسڵمانی راستەقینەش سەرچاوەی خێرو چاکەیە بۆ هەموو لایەك و هەموو كەس بە بوونی ئەو ناسوودەیە، چونكە دڵنیایە كە ئەگەر تاكی موسڵمان سوودی بە بەرامبەر نەگەێنێت ئەوە بە هیچ شێوەیەك نابێتە مایەی ئازارو ئەزیەت و ئاژاوەنانەوە، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) كە پێناسەی موسڵمان دەكات دەفەرمویت: (**الْمُسْلِمُ من سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ من لِسَانِهِ وَيَدِهِ**)رواه البخاري. لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) هەردەم هانی تاكەكانی داوە، كە یەكدیگربن و كار بكەن بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و ئاشتەوایی كۆمەلایەتی و بەشدار بن لە بنیاتنانی كۆمەڵگا، هەروەها لە چەندین فەرموودە داوای لە موسڵمانان كردووە كە خۆیان بەدوور بگرن لە هەموو جۆرە كارێك كە ترس و تۆقاندن بڵاودەكاتەوە، چونكە ئەو نەتەوەی لە ترس و دڵەراوكێ بژیت نەتەوەیەكی بێهێزو لاوازو دواكەوتوو دەبێت و هەرگیز ناتوانێت ركابەری ولاتە پێشكەوتووەكان بكات لە ڕووی ئابووری و سیاسی و كۆمەلایەتیەوە، لەسەر ئاستی تاكەكانیش ئەم بارودۆخە ئاسەواری نێگەتیڤی دەبێت، چونكە ناتوانن باش بیربكەنەوەو داهێنان بكەن و چالاكی ئەنجامبدەن و ببنە تاكێكی سوودبەخش بۆ كۆمەڵگاكەیان،

بە هۆی ئەوەی بیرو هۆشیان سەرقاڵ دەبێت بە پاراستنی خۆیان و خانەوادەیان . بۆیە ئێمە ئەگەر بمانەوێت کوردستانی ئازیزمان پێشبکەوێت لەبوارە جیاجیاکان‌و بەهرەو داهێنان بوونی هەبێت لەم ولاتە، دەبێت هەموو لایەك کار بکەین بۆ پاراستنی ئەم نیشتیمانە بە پەیڤ‌و وشەو و پێنووس‌و بەروح‌و بە گیان، هەر یەکەو لەشوێنی خۆی دەبێت رۆڵ بگێرێت لە پاراستنی، بێگومان ئەمنی فیکری‌و وشیارکردنەوەی تاکەکانیش یەکێکە لەو بوارە گرنگانە، کە دەبێت رۆشنبیران رۆڵی خۆیان تێدا بگێرن.

لەم سونگەوە بەرێز مامۆستا (مەلا عەبدوڵلا شێرکاوەیی) لەم هەلومەرجە هەستیارەدا ئەم پەرتووکە بەنرخەی نووسیوە، کە هەوڵێکی گرنگ‌و جددیە بۆ شیکردنەوەی چەمکی ئەمن‌و ئاسایش لە روانگەی ئیسلامەوەو توانیویەتی ئەم چەمکە بەتێرو تەسەلی روون بکاتەوە بە پشت بەستن بەئایەت‌و فەرموودەو وتەی زانایان، بە شێوازێکی زانستی‌و ئەکادیمی ئەم پرسەی لە روانگەی ئیسلامەوە ورووژاندووە.

لێرەوە دەستخۆشی لە نوسەر دەکەم‌و داوا لەو کەسانە دەکەم، کە بەدوای زانیاری دەربارەی چەمکی ئەمن‌و ئاسایش لە روانگەی ئیسلامەوە دەگەرێن، روو بکەنە ئەم پەرتوکەو بە وردی بیخوێننەوە، بەدڵنیاییەوە مەبەستەکانی خۆیانی تێدا دەدۆزنەوەو تێنوێتیان دەشکێ‌و سوودێکی باشی لێوەردەگرن.

**دکتۆر محمد شاکر محمد صالح**

**راگری کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان- زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر**

٣٠ / ١٢ / ٢٠١٤

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**الحمد لله ربّ العالمين والصلاة والسلام على أشرف المرسلين وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين..**

بەرجەستە کردنی ئارامیو ئاسایش، بە یەکێك لەو بنەما گەورانە هەژمار ئەکرێت، کە ژیانی مرۆڤەکانی لەسەر ڕێك ئەخرێت، یەکێکە لە مافە گرنگو بنچینەکان، کە پێویستە بەردەوام پەرەی پێ بدرێتو پارێزگاری لێ بکرێ.

ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش بە یەکێك لە نیعمەتە پڕ بایەخەکانی داناوە، کە بە سەقامگیر بوونی ئەمنو ئاسایش، خۆشیو ئارامی لە نێو کۆمەڵگەدا پەرە ئەسێنێو گەشە ئەکات.

هەر بۆیە خوای گەورە لە سورەتی (قورەیش) هەندێ لە نیعمەتو بەهرەکانی خۆی یادی قورەیش ئەخاتەوە، کە نیعمەتی ئەمنو ئاسایشو قوتاربوونە لە برسیەتی، وەکو ئەفەرموێ: (فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ، الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ) قريش:٣-٤. واتە: هەر خاوەنی ئەم ماڵەیە (کعبە الله) بپەرستنو سەری نەوازشو بەندایەتی هەر بۆ ئەو دانەوێنن، ئەو خوایەی کە قوتاری کردن لە برسیەتیو هێوریشی کردنەوە لە ترسو بیم، وە ئەمنو ئاسایشی پێ بەخشین.

ئەم ئایەتە ئاماژە بە دوو نیعمەتی هێکجار گەورە دەکات، دوو نیعمەت کە دوو پێداویستی بنەڕەتی مرۆڤ تێر دەکەن، ئەوانیش: بژێویو ئاسایشو دووریە لە ترسو بیم.

خراپترین شتێ، کە تووشی هەر کۆمەڵەیەك بێت! ئەوەیە ئەو دوو نیعمەتەی لێ بسەنرێتەوەو، تووشی برسیەتیو ترس ببێ.

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێ: (**وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ**) النحل:١١٢. واتە: خوا نمونەی ئاواییەکی ئاوەدان دێنێتەوە، کە پڕ لە ئاسایش و ئارامی و خۆشگوزەرانی و ئاوەدانی بوو، ڕۆزی و رزقێکی زۆری لە هەموو لایەکەوە بۆ دەهات، کەچی لەم لاو لەولای ئەوانیشەوە خەڵك تالان ئەکراو دەڕفێنران، بەڵام ئەو گوندە نا سوپاسی نیعمەت و بەهرەکانی خوای کرد، بۆیە خوای گەورەش بەرگی برسیەتی و ترس و بیمی کرد بە بەریاندا.

لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خۆشەویستمان ئاماژە بە (ئاسایش) لە سێ نیعمەتی سەرەکیدا ئەکات، کە مرۆڤ پێویستیەتی تا هەست بە رەحەتی و دڵئارامی بکات، کە ئەو سیانە هۆی کامەرانی هەموو تاکێکن، ئەفەرموێ: (**من أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ له الدُّنْيَا بِحَذَافِرِها**) رواه الترمذي، واتە: هەر کەس رۆژ بکاتەوەو لە شوێنی خۆی ترسی نەبێ، لە ئاسایش دابێ، جەستەی تەندروست و سەلامەت بێ، قوت و بژێوی ئەو رۆژەی هەبێ، وەك ئەوە وایە سەراپای دونیای بۆ کۆکرابێتەوە.

لە روانگەی ئەم ئایەت و فەرموودەیەوە، ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئیسلام دەستەبەر کردنی ئاسایشی بۆ هەموو خەڵکی بە یەکێ لە مەبەستە بنچینەییەکانی شەریعەت ناساندووە، هەروەك زەوت کردنی ئاسایشی خەڵکیشی بە تاوانی گەورە داناوە، کە سزای توندی لەسەرە، لەبەر ئەوەشە دەست برینی دزی کردۆتە سزا، چونکە ئەمنیەت و ئاسایشی ئەو ماڵە، یان ئەو کەسە تێك ئەدات کە دزی لێ دەکرێ.

هەروەها ئیسلام سزای رێگران و تالانچیە چەکدارەکانی زیاتر توند کردۆتەوە، لەبەر هەمان هۆ، واتە لەبەر ئەوەی ترس و تۆقاندن و شێواندنی ئەمن و ئاسایشی تێدایە، تەنانەت ئەوانەی بەوە وەسف کردووە، کە دژی خواو پێغەمبەر دەجەنگن و، هەوڵی بلاوکردنەوەی پشێوی و ئاشوب و گەندەڵی دەدەن، (يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا)، هۆکەشی ئەوەیە، کە ئاسایشی کۆمەڵگە دەشێوێنن و ترس و بیم بلاو دەکەنەوە، ئەوەش دەچێتە خانەی جەریمەو تاوان و، بە تیرۆری مەدەنی ئەژمار ئەکرێ.

لەبەر ئەوەیە ئیسلام هەموو ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی _ هەر چەند سادەو کەمیش بێت_ بەو گوناهو تاوانانە داناوە، کە خوای گەورە حەرامی کردوون و، لە پاشە رۆژدا سزای بۆ داناون.

لە فەرمودەدا هاتووە (نعمانی) کوڕی (بەشیر) دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەخزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بوین، پیاوێك لەسەر ولاخەکەی خەوبردیەوە، هاوڕێیەکی تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا، واتە شۆخی و گاڵتەی لەگەڵدا کرد، پیاوەکە لە خەو راچڵەکاو، ترسی لێ نیشت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا) بۆ هیچ موسڵمانێك دروست نیە موسڵمانێکی تر بترسێنی.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەمەی لە کاتێکدا فەرموو، کە ئەو کارە بە سوعبەتیش بوو، هیچ ئازارێکی جەستەیی تیا نەبوو، تەنها لەبەر ئەو تۆزە ترس و داچڵەکاندە!!

ئەبێت ئەوەش بزانین کە فەرموودەکە ناوی موسڵمانی هێناوە، هەر تایبەت نیە بە موسڵمان، ئەوە لەوێدا هەردووکیان موسڵمان بوون، ئەگەرنا فەرموودەی تر هەیە، کە باس لە ئاسایشی هەموو خەڵکی ئەکات بە موسڵمان و ناموسڵمان، ئەفەرموێ: (الْمُؤْمِنُ من أَمِنَهُ الناس على

دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ) رواه النسائي، واتە: بڕوادار ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە خوێن و ماڵیان ئەمین بن لەسەر دەستی.

بۆیە بەرجەستە کردنی ئەمن و ئاسایش و بەرقەرارکردنی و پارێزگاری لێکردنی ئەرکێکی (ئایینی، نیشتمانی، نەتەوەیی) هەموو تاکێکی ئەم وڵاتەیە بە بێ جیاوازی.

کاتێك چاوم بەو نووسینە کەوت بەناوی (ئەمن و ئاسایش لە روانگەی ئیسلامەوە_ کوردستان وەك نمونە)، لە نوسین و ئامادە کردنی مامۆستای لاوو، خامە ڕەوان و بەپێز مامۆستا مەلا عەبدوڵلا شێرکاوەیی، زۆر خۆشحاڵ بوون، چاو و دەرونم گەشاوە، بەراستی لەرووی زانستی و بابەتیەوە زۆر بەپێزو بەهێزو سەرکەوتووە، بەشێوەیەکی ئەکادیمی و زانستی و سەردەمیانە نووسیویە، پەنجەی خستۆتە سەر زۆربەی خاڵە گرنگ و پێویستیە هەنووکەییەکانی ئەمڕۆ، وە چارەسەری واقعیانەشی بۆ داناون.

زۆر جێگەی دەست خۆشی و دوعای خێرە، وە جێگەی ئەوەیە ئەم کتێبە بە دەیان هەزاری لێ چاپ بکرێت و، بچێتە هەموو ماڵ و کتێبخانەیەك، وەك پرۆگرامی خوێندن لە ناوەندەکانی خوێندن سوودی لێ وەربگیرێ و نەوەی نوێی گەلەکەمان لێ بەهرەمەند ببێت، پێم وایە ئەم کتێبە کەلێنێکی باش لە کتێبخانەی کوردی پڕ ئەکاتەوە، چونکە تا ئێستا بە زمانی کوردی بابەتێکی وا گرنگ لەسەر ئەمن و ئاسایش نەنوسراوە، بەتایبەتی لە روانگەی ئیسلامەوە.

ئەم کتێبە هەوڵ و هەنگاوێکی نوێیە، شیکاری جوان و رێنمایی باش و هەنگاوی پێویست و پەیوەستی لەم بارەوە خستۆتە ڕوو، بە ویستی خوای گەورە زۆر سوودمەند ئەبێت بۆ ئیمڕۆی کۆمەڵگەی کوردی.

داواکارم خوای گەورە لێی قەبوڵ بکات و، بیکاتە توێشووی کاروانی قیامەتی و، هەمیشە خامەی وا رەنگین و جوان و شیرین و بەپێز و بەهێز و بە برشت بێ و، نمونەی مامۆستا مەلا عەبدوللا شێرکاوەیی هەر زۆر بێت، کوردستانی ئازیزیش هەر ئاوەدان و رازاوەو پارێزراو بێت، ئەمن و ئاسایش و ئارامی و برایەتی و یەکریزی و تەبایی و خۆشەویستی رۆژ لەدوای رۆژ لەگەشەو نەشەو پڕشە دا بێت. هەر شاد و ئاسوودەو کامەران بن.

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.**

**مەلا ئەحمەدی شافیعی**
**ئەندامی لیژنەی باڵای فەتوای**
**یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی کردستان**
**٢٠١٤/١١/١٠**

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی

الحمد لله الذي جعل الأمن قوام العيش الكريم، وله الحمد على عظيم آلائه، والشكرُ له على جزيل كرمِه ونوالِه، والصلاة والسلام على سيدنا محمد (ﷺ) المبعوث رحمة للعالمين، الذي أرسله الله تعالى بالهدى ودين الحق بشيراً ونذيراً، وعلى آله وأصحابه ومَن تبعهم بإحسان الى يوم الدين:

**خوێنەری ئازیز:** ماوەیەکی درێژ بوو وەك هەست کردن بە بەرپرسیارێتیو گەیاندنی خزمەتێك بەو کوردستانە شیرینە، ئامەزرۆ بووم لەبارەی گرنگیو بایەخی ئەمن و ئاسایش شتێك بنوسم، چونکە ئەو پرسە پەیوەندییەکی نزیكو بەردەوامی بە تێکڕای تاکەکانی کۆمەڵگەو ژیانی مرۆڤەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەش کاریگەری ئەرێنی بۆ پێشکەوتن و گەشەی کۆمەلآیەتیو ئامانجە گشتیو تایبەتیەکان گەلێك زۆرە.

لەلایەکی ترەوە هەبوونی ئەمن و ئاسایش بۆ هەر گەلو ولآتێك، پێویستیەکی گرنگو پرسێکی هەستیارە، لەسەر ئەو بنەمایە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بایەخێکی زۆری پێ داوە، خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز باسی لەو نیعمەتە کردووە، وە یەکێ لە مەهامو کارو هەنگاوی پێغەمبەران فەراهەم کردنی ئارامی کۆمەڵگە بووە، یەکەم دوعای پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێ) بۆ دەستەبەربوونی ئاسایشی شارو ولآتەکەی بوو.

ئیسلام وەك دوایین ئایین وێڕای ئەوەی سەرچاوەیەکی گرنگو گەورەیە، لەهەمان کات پێشکەوتووە لە دانانی سیستەمی گونجاو بۆ هێنانەدی ئەمن و ئارامیو، رۆڵی دیاریشی گێڕاوە لە دابین کردنی ئەمنیەتی ولآتو چارەسەرکردنی زۆرێك لە کێشەکانەوە.

پێغەمبەر (ﷺ)، گرنگی زۆری داوە بە مەسەلەی (ئەمن)و دەیان فەرموودەی لەو بارەوە هەیە، تەنانەت لەسەردەمی خۆی بەڕێوەبەری ئاسایشی بۆ شار دیاری کردووە، دوای ئەویش خەلیفە راشیدەکان بە هەمان شێوە پەرەیان بە مەسەلەی (ئەمنی قەومی) داوە، چ لە رێی بلاوکردنەوەی هۆشیاری‌و چ لە رێگەی تێکەلاویان لە گەلّ خەلکەوە، چونکە دەرکیان بەو راستیە کرد بوو کە کۆلەگەی سەرەکی ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان دەگەرێتەوە بۆ ئاستی متمانەی نێوان خەلك‌و فەرمانڕەوا، کاتێك ئەو متمانەیە هەبوو زۆر ئاسانە پەرە بە ئەمن بدرێ، بەلام بە پێچەوانەوە مەسەلەکە دژوار دەبێ.

ئیمامی ئەبوبەکری (رەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی خەلافەتی خۆی فەرمانی دەرکرد، عەبدوللای کوڕی سەعید بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی خەلك‌و ناوچەکە لەشەودا بەناو کوچەو کۆلان‌و شاردا بگەرێت، لەسەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) سەربازگە دروست کراو، تەنانەت هێزو سوپای لە خەلکی مەدەنی جیا کردەوە، لە سەردەمی (ئەمەوییەکان) سیستەم‌و هێزی پۆلیس‌و پاراستن بۆ چاودێریکردنی کەسانی گومان لێکراو ئامادە کرا، ناسنامەی باری کەسیان بۆ هاولاتیان دانا، ئەمانە هەموو بۆ ئەوە بوو بتوانن سیستەمی ئیداری‌و سیاسی‌و کۆمەلایەتی رێك بخەن‌و، کۆنترۆلی ئەمن‌و ئاسایشی خەلك‌و خاك‌و کۆمەلگەی ئەوسا بکەن.

دوای ئەوەش بەپێی هەلومەرج‌و قۆناغەکان، شێوازو میکانیزمی پاراستنی ئاسایش‌و دابین کردنی ئەمنیەت گۆڕانی بەسەر داهاتووەو، هەر گەلەو بەپێی واقعی خۆی چوارچێوەی بۆ دۆخی ئەمنی دارشتووە، گەلی کورد بە حوکمی موسلمانێتی‌و دۆخە کۆمەلایەتی‌و مێژوویەکەی، هەمیشە دوو شت بەلایەوە گرنگ بووەو لێکی جیا نەکردۆتەوە: یەکەمیان: ئینتیما بۆ دین (ئایینی ئیسلام). دووەمیان: ئینتیما بۆ نەتەوە.

لەسەر ئەو دوو بنەما گرنگە کە تەواوکەری یەکترن، پرسی سەقامگیری‌و ئاسایشی نەتەوەیی پەرەی سەندووە، هەرچەند لە کوردستان گەلێ جار هەست بەوە دەکرێ کەسانێك هەن

لەبەر شۆڕبوونەوەو پابەندیان بە دینداریەوە، خەم لـە لایـەنی نەتـەوەیی و نیشـتمانی و پرسـی ئەمن و ئاسایشی وڵات ناخۆن و تا رادەیەك ئەو هەستەیان پەراوێز خستووە، هەروەك بەشێکیش لەبەر قوڵبوونـەوە لەهەسـتی نەتـەوەیی و نیشـتمانی هەسـتە دینداریەکـەی کـزو لاواز بـووە، لەکاتێکدا ئیسلام مەسەلەی دیـن و دەوڵـەت، کیـان و کۆمەڵگـە، ئـەمن و ئـارامی، نەتـەوەو نیشتمان، بە تەواوکەرو دوانەی یەکتر دادەنێ، لەچوارچێوەو روانگـەی ئـەو بنەمایـەوە نـابێ دینـداری خـەمی خـەڵك و خاکمـان لـەبیر باتـەوە، وەك چـۆن نـاکرێ نەتەوەپـەروەری و نیشتمانپەروەری و کوردایەتیش خەمی مرۆڤایەتیمان لا نـەهێڵێ و ویـژدانی ئینسـانیەتمان کـزو لاواز بکات، گونجاویش نیە نیشتماندۆستی بەرەو بێ دینی و لاپەرگەیی و دوورەپەرێزی و دابڕان و دەمارگیریمان بەرێت.

بۆیە دەبێ موسڵمانان بە گشتی و زانایانی ئاینی بەتایبەتی کە توێژێکی کاریگەرن لـەناو کۆمەڵگە، رۆڵیان لە بەرقەرار کردنی ئاشتی و ئاسایش هـەبێ و، هەسـتی پارێزگـاری نەتـەوەو نیشتمانیان تێدا بەرجەستەو زیندوو بێت.

گوتاری ئاینی و وتاری هەینی دەورێکی باڵای لەو بوارە هەیەو دەبـێ، لەبـەر ئـەوەی لـە هەژمارونی چواردە سەدەی مێژووی موسڵمانان ئـەوە سـەلماوە، کـە ئـەو وتـارە بـە یـەکێ لـە کاریگـەرترین سەرچـاوە دێـت بـۆ بانگەشـەی ئیسـلام و بڵاوکردنـەوەی هۆشـیاری ئـاینی و پەروەردەکردنی تاکەکان و، داڕشتنی شێوەی بیرکردنەوەو هەست و ویژدان و ئاراسـتەی شـەقامی کوردستان بە لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندیە باڵاکانەوە، لەئێستاشدا وتاری هەینی ئامادەییەکی بەرچاو و رۆڵێکی کاراو دەورێکی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگـەو، ژیـانی رۆحـی و فەرهـەنگی و فکری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی هەیە.

بۆیە هەمووان چ وەك (تاك) چ وەك (موسڵمان) لەمەڕ ئەو پرسە بەرپرسیارین، چونکە لـە تێڕوانینی ئیسلام دەستەبەرکردن و پاراستنی ئەمنیەت ئەرکێکی ئیمانی و ئینسـانی گەورەیـە، بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکەش پێویستە هۆشیاری و دڵسۆزی پێویسـت لـەناو تاکـەکان بـوونی

هـەبێ، لەهـەمان کـات بـەپێی داخـوازی شـەریعەت و سروشـت و پێکهاتـەی هـەر نەتـەوەو کۆمەڵگەیەك، ناکرێ پرسێکی وا گەورە پشت گوێ بخرێ و نەبێتە جێی بایەخی موسڵمانان.

ئەم (( کتێبە )) کە خۆی لە هەشت بـەش دەبینێـتەوەو پشـت ئەسـتوورە بـە ئایـەت و فەرموودە، هەوڵ و هەنگاوێکی گرنگە، کە لەچوارچێوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام شـیکاری ئـەو پرسەی کردووەو، ڕێنمایی و هەڵوێست و هەنگاوی پێویست و پەیوەسـتی لـەو بـارەوە خسـتۆتە ڕوو، بەو ئومێدەی ئەو نووسینە ببێتە خشتێکی ڕێك و پێك لە پڕکردنـەوەی کـەلێنێکی دیـاری دیواری ئەو بینـا گـەورەی کۆمەڵگـەی کـوردی و، بەرچـاو ڕوونیـەك بـۆ خوێنـەرانی کـورد و خەمخۆرانی کوردستانەوە.

سوپاس بۆ خوای بەخشندەی میهرەبان، کە یارمەتی دام ئـەم کـارە تـەواو بکـەم و ئـەوەی (بەردەست)ی لێ بەرهەم بێ، هیوام وایە خوای گەورە بە لوتفی پڕ خێـرو ڕەحمـەتی خـۆی لـێم وەربگرێ و بیخاتە تای تەرازووی چاکەکانم، لەلایەکی تریشەوە بە خوێنەری ئـازیز دەڵـێم: ئـەم نووسینە ئەگەر چاکەی پێکا بێ، فەزڵی خوای میهرەبانەو ڕەجای دوعای خێرم هەیـە، ئەگـەر کەم و کوڕی و ناتەواویشی لێ بەدی کرا، ئەوە لەمنەوەیەو داوای لێبوردن دەکەم، لەبەر ئـەوەی مرۆڤ بێ هەڵە نابێ و، تەواوێتیش تەنها لایەق بە خوایە.

(( رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ))

**مەلا عەبدوللا شێرکاوەیی**

**٢٠١٤/١٠/١٠**

**شێرکاوە _ باڵەکایەتی**

Sherkaway٨٣@gmail.com

# باسی یەکەم
# دەروازەیـەکی پێـویسـت

قسە کردن لەسەر ئەمن و ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان، قسەکردنە لەسەر پرسـێکی گرنگـی پێویستو پەیوەست بە تێکڕای جومگەو کونو کەلەبەرەکانی ژیانی مرۆڤو کۆمەڵگەوە، بۆیـە لە سروشتو بنەڕەتدا ئارامیو هێمنیو ئاسایشی ئـەو ژینگەیـەی مـرۆڤ ژیـانی تێـدا بەسـەر دەبات، شتێکی ویستراوەو هەموو خەڵك حەزی پێ دەکـاو ئامـەزرۆو شـەیدایەتی، سـەرەڕای ئەوەی ئەم بابەتە پرسێکی بە لقو پۆی هەمەجۆرەو، بواری جیاجیای لەخۆ گرتـووە، لەهـەمان کات پرۆسەیەکی گرنگەو لە فەرهەنگی ئیسلامیشدا ئارامیو ئۆقرەیی ئامـانجێکی سـەنگینو لەجێو دروستو رەوایەو، بەشێکە لەو هەستە دینداریەی مرۆڤ هەڵیگرتووە.

لە زۆربەی وڵاتان بەمەبەستی گەیشتنو دەستەبەرکردنی ئـەمن و ئاسـایش بـۆ وڵاتەکـەیان دەیان کۆڕو سیمیناری پەیوەست بەو پرسە سا دەکەن، بگرە سەدان بابەتو توێژینەوەی لەسـەر دەنووسن، بۆ ئەوەی تاکـەکان لـە گرنگـی بابەتەکـەو مەترسـی نـەمانی ئەمنیـەت هۆشـیار بکەنەوە.

دەستەبەربوونی ئارامیو ئاسایش لەهەر وڵاتو شوێنێك، پێویستی بە کۆششو بەرنامـەو هۆشیاریو بەرپرسیارێتیو قەوارەیەکی تایبەت هەیە، بـەو پێیـە دەبـێ ئـەوە بـزانین کـە بـۆ فەراهەم بوونی ئەمن و ئاسایش کۆمەڵێك فاکتەرو رێکارو ئالیەت پێویسـتە، لەگـەڵ ئـەوەش کۆمەڵێك هۆکارو پێشهات هەیـە دەبنـە مایـەی تێکچـوونو شـێواندنو نـەمانی ئـارامیو، کەوتنەوەی ترسو بیمو توندو تیژی لەکۆمەڵگەدا.

ئارامیو ئاسایش گرنگترین بنەمای ژیانە لە واقعی هەر نەتەوەو کۆمەڵگەیەکدا، چـونکە بێ بوونی قەوارەیەکی ئارامو ستراتیژێك بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانو دەستەبەر کردنی ژیـان بۆ هاوڵاتیان، ئاسان نیە هیچ کیانو ئەزموونێك سەرکەوتن مسۆگەر بکات.

پەیدا بوونی فکرەی ئاسایشی نەتەوەیی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە مرۆڤ نیشتەجێی سەر زەوی کراوە، ئیدی بەرە بەرەو بە پێی قۆناغو دۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان، خەڵك بیری لەوە کردۆتەوە قەوارەیەکی ئەمنی بۆ خۆیان دەستەبەر بکەنو لە ژێر سێبەریەوە بە شێوەیەکی ئاسایی ژیان بەسەر بەرن، بە پێی زەمەنو پێشکەوتنی شارستانیەتو هاتنی ئاینیەکان، مەسەلەی ئەمنو ئارامی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە ئەگەر ئەمن نەبوایە شارستانیەت درێژەی نەدەکێشا یان هەر نەدەبوو، ئەگەر تەماشا بکەین تێکڕای ئاینیەکان دواتریش تایبەت تر ئاینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی زۆریان بەو مەسەلە داوە، بۆ نمونە ئیسلام لە مێژووی مرۆڤایەتی شۆڕشێك بوو کە گۆڕانی بەسەر جیهانو واقعی میللەتاندا هێناو پەرەی بە ئەمنو ئاسایش دا، لەسەر بنەمای فکریو سیاسیو ئەخلاقیو رۆحیو کۆمەڵایەتی ئەم فکرەیەی دامەزراندو چەندین میکانیزمی بۆ دیاری کرد، لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی ئیسلام لەسەر بنەمای پەیوەندی مرۆڤ بە خودی خۆیو مرۆڤ بە مرۆڤو مرۆڤ بە خوای خۆیەوە زیاتر گەشەی سەند.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وەك نێردراوێك لە لایەن خواوە بۆ مرۆڤایەتی، گرنگی زۆری داوە بە مەسەلەی (ئەمن) چ لە ژیانی ئاشتیو چ لە ژیانی جەنگ، لە دەقە پیرۆزەکانیشیەوە ئەمە دیارە، دوای ئەویش خەلیفە راشیدەکان بە هەمان شێوە بە پێی دەستەلاتی خۆیان، کە حوکمی ئیسلامەتیە پەرەیان بە مەسەلەی ئەمنی قەومی داوە، چ لە رێی بلاوکردنەوەی هۆشیاریو چ لە رێگەی تێکەلاویان لە گەڵ خەڵکەوە، دەکرێ بڵێین کارو هەنگاو و بەرنامەی هەر چوار پێشەوای ئیسلام، بەڵگەی روونو راشکاون سەبارەت بە بابەتی ئەمنو ئاسایش، کە پرسێکی گرنگەو پێویستە پارێزراو بێت، ئەوەش بە فیعلی لەسەردەمی خەلافەتیان رەنگی داوەتەوەو کاری بۆ کراوەو لەبەرچاویش گیراوە، لەو کات ئەمنو ئارامی بێ جیاوازی بۆ هەموو تاکەکان فەراهەم بووە، تەنانەت سەردەمی ئیمامی عەلی مافی

ئەمنیەت بۆ خەواریجەکانیش دابین کرا، لە کاتێکدا کە ئەوان بەرهەڵستکاری سەرسەختی ئەو پێشەوایە بوون[1].

نەبوونی بەربەست لە نێوان خەلیفەو خەڵك مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بووە، بۆ بە واقعی کردنی ئاسایشی نەتەوەیی و بڵاوکردنەوەی بە رووی ولاَتاندا.

بەپێی تێپەڕبوونی زەمەن و دواتر کە تیحتیکاك بە شارستانیەتی تر کراو دەستەڵات گۆڕانی بەسەر داهات، ئەمنی قەومیش سیماو سیستەمێکی تری وەرگرت و وای لێ هات مەسەلەکە زۆر ئاڵۆز بێت، چونکە فەلسەفەی ئەمنی قەومی دەگەڕێتەوە سەر متمانەی تاك بە دەستەڵاتەوە، کاتێك ئەو متمانەیە هەبوو زۆر ئاسانە پەرە بە ئەمن بدرێ بەڵام بە پێچەوانەوە مەسەلەکە دژوار دەبێ و بنەما سەرەکیەکە تێك دەشکێت.

بەپێی مێژووی شارستانیەت و مرۆڤایەتی، ئایین رۆڵێکی کاراو گرنگی هەبووە، لە تەرکیز کردن لە هەبوونی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی و، وەك بەشێکی دانەبڕاو و سەرەکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەژماری کردووە.

لەو نێوەشدا بە پێی سەرچاوە دروستەکانی ئیسلام و زۆرێك لە دەقەکانی قورئان و فەرمودە، ئەو راستیەمان بۆ دەردەکەوێت، کە پرسی ئارامی و ئاسایش شتێکی پێویست و هەستیارە بۆ کۆمەڵگەو ژیانی مرۆڤایەتی.

***

[1] - نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين: ل/١٦٦

# باسی دووەم
# پێناسەی چەمکی ئەمن و ئاسایش

واتای زمانەوانی وشەی (الأمن)، بەپێی سەرچاوە فەرهەنگیەکان، واتە: ئاسایش و ئارامی و هێمنی و دڵنیایی[1]، بەمانایەکی تر واتای ئەوە دەگەیەنێت کە پێچەوانەی ترس و بیم و دڵەڕاوکێیە[2]، وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووەو دەفەرموێ: (وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ)[3]، واتە: لە ترس و بیمی (جەردە و ڕێگران) پاراستوونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

لە شوێنێکی تر دەفەرموێ: (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ)[4]، واتە: هەر کاتێك هەواڵێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی، یاخود ترس و بیم، بڵاوی دەکەنەوە. هەروەها دەفەرموێ: (وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ)[5]، واتە: سوێند بەم شارە ئەمینە، کە (مەککە)یە.

بەدیوێکی ترو بەپێی پێناسە زاراوەییەکەی، چەمکی ئاسایش واتە: هەستکردن بە هێمنی و هەبوونی ئارامی و سەقامگیربوونی دۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و نیشتمانی ...هتد.

هەرچەند زۆر جار ئەو پرسە دابەشبوونێکی شەکڵی بەخۆیەوە دەبینێ، بەوەی دەگوترێ: ئاسایشی نەتەوەیی، ئاسایشی نیشتمانی، ئاسایشی کۆمەڵایەتی، ئاسایشی سەربازی، ئاسایشی تەندروستی، ئاسایشی خۆراك، ئاسایشی ئابووری، ئاسایشی فکری، ئاسایشی هەرێمی، ئاسایشی نێودەوڵەتی..

---

[1]- فەرهەنگی دەریا: ب/١ ل/٤٢
[2]- مختار الصحاح: ل/٢٦
[3]- قريش: ٤
[4]- النساء: ٨٣
[5]- التين: ٣

بەڵام ئەوەی زۆرتر باوەو لەرووی پلەبەندیەوە گرنگ و جێی باسە، مەسەلەی ئاسایشی نەتەوەییە، ئەگەرچی لە ئێستا ئالیەت و گۆرانێکی نەوعی هاتۆتە پێش و، هەر وڵاتەو بەپێی دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی بنەماو چوارچێوەی ئەو پرسە دیاری دەکات.

دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین، کە چەمکی (ئەمن_ ئاسایش) لەرووی دەربرین و دارشتنەوە، نزیکترین وشەیە لە چەمکی (ئیمان_ باوەر)وە، چونکە وشەی (الإیمان) لەزمانی عەرەبی بەچەند واتایەك دێ و گشتگیرەو لەوەشدا واتای وشەی (الأمن)ی لەمەغزاو ناوەرۆکدا هەڵگرتووە[1]، دیاریشە بێ بوونی (ئەمن)و (ئیمان) هیچ کارو خێرو بێرو هەنگاوێکی دین و دونیا سەرناگرێ و سوود بەخش و مسۆگەر نابێ.

لە ئەنجامی خستنە رووی ئەو پێناسەیە دەگەینە ئەو راستیە، کە مەسەلەی ئاسایش و ئارامی نەتەوەیی، پێویستیەکی حەتی و هەمیشەیی ژیانی مرۆڤە، گرتنە بەری رێوشوێنی ئەمنیش بۆ پاراستنی نیشتمان و بەرژەوەندیە گشتی و جموجۆڵە ناوەکی و دەرەکیەکان و، رووبەروو بوونەوەی پێشهات و ئەگەرە ئاڵۆزو خەتەرناکەکان، ئەرك و بەرپرسیاریەتێکی هەمەلایەنەو، دواجار بە پلەی یەکەم لەسەر شانی دەوڵەت دەوەستێت.

کەواتە لە ماناو مەغزای چەمکی (ئاسایش) ئەوە دەردەکەوێ، کە هەبوونی ئارامی و هێمنی لەناو خەڵك، مەسەلەیەکی هەستیارو داخوازیەکی دانەبراوی نێو پرۆسەی ژیانە، وە بوونی تواناو پلان بۆ دەستەبەرکردن و پاراستنی قەوارەی ئەمن و ئارامی کۆمەڵگە، تاکە هۆکارە بۆ بە ئاسایی بەرێوەچوونی ژیان و بەرژەوەندیەکانی مرۆڤ لەهەر ئان و ساتێکدا.

***

[1]- أصول الإيمان والإسلام: ل/٢١

# باسی سێیەم

## جیاوازی نێوان ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی

بەر لەوەی بچینە سەر جیاوازیەکە پێم خۆشە ئاماژە بەوە بکەم، کە گەلی کورد بە حوکمی موسڵمانیەتی و دۆخە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەی، هەمیشە دوو شت بەلایەوە زۆر گرنگ بووە و لێکی جیا نەکردۆتەوە:

یەکەمیان: ئینتیما بۆ دین، بەو پێیەی گەلێك بووە ئارەزومەندانە ئاینی ئیسلامی قەبوڵ بووە و پەیرەوی لێ کردووەو، پەرێزو مێژوویێکی رەسەن و شکۆمەندی لەو بارەوە هەیە.

دووەمیان: ئینتیما بۆ نەتەوە، لە چێوارچێوەی ئەو سۆزە مرۆڤدۆستی و هەستە نیشتمانی و نەتەوەپەروەریەوە، هەمیشە هەوڵ و کۆششی بۆ پارێزگاری و پاراستنی کیان و داکۆکی کردن لە مافە نەتەوەییەکان بووە، بەردەوامیش قوربانی و خەباتی بۆ ئەوە کردووە گەلی کورد بە ئازادی بژی و کوردستان پارێزراو بێ و کیانی نەتەوەیش سەقامگیرو ئارام بێت.

لەسەر ئەم دوو بنەمایە، پرسی سەقامگیری و ئاسایشی نەتەوەیی لای ئێمە پەرەی سەندووە، چونکە هیچ دژیەك لەوەدا نیە، کە من کورد بم و موسڵمان بم، یان موسڵمان بم و کورد بم.

وێڕای ئەمەش ئاین بێ بوونی نەتەوە، نەتەوەش بێ بوونی ئاین هیچ رۆڵ و خزمەتێك دروست ناکەن، چونکە بەپێی چوارچێوەی زانستی و لۆژیکی لەرووی تیۆریەوە ئیسلام رۆڵ بە کۆمەڵگەو نەتەوە دەدات، بەڵام لەرووی پراکتیکی و جێبەجێ کردن و پابەندیەوە نەتەوە رۆڵ بە ئیسلام دەدات.

کەواتە لەچوارچێوە ئاسایيەکەدا، مەسەلەی ئینتیما بۆ دین و نەتەوە تەواوکەری یەکترن و، تەنانەت زۆر جار ئاین بەتایبەت ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ڕۆڵی پێشەنگی و رابەری گێراوە لە چارەکردنی کێشەی نەتەوەیی و، دابین کردنی ئەمن و ئەمانیەوە.

ئاسایشی نەتەوەیی واتە دابین کردنی ئەمن بۆ بەرژەوەندی نەتەوەو پاراستنی تایبەتمەندیەکانی، لێرە ئیشکالیەتێك هەیە لە نێوان ئاسایشی نیشتمانی و ئاسایشی نەتەوەیی، ئەگەر بڵێین ئاسایشی نیشتمانی واتە دەوڵەت و پێکهاتەکانی، بەڵام ئاسایشی نەتەوەیی واتە کیان و گەل با دەوڵەتیشی نەبێ، بەڵام لە ئێستادا زیاتر دەگوترێ (ئەمنی قەومی_ ئاسایشی نەتەوەیی) چونکە ئەمنی قەومی تایبەت نیە بە هەبوونی دەوڵەت، ئەگەر وابێ ئێمەی کورد دەوڵەتمان نیەو نابێ بەدوای ئەمن و ئارامی بکەوین! بەڵام ئاسایشی نەتەوەیی هەموو کیانێك دەگرێتەوە بە ئێمەشەوە، کە چەندین ساڵە بە دوای دەگەڕێین و کۆششی زۆریشمان لە پێناویدا کردووەو خوێنی زۆریشمان لەپێناو ڕشتووە.

دابین کردنی قەوارەیەکی ستراتیژی بۆ پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی بەشێوەیەکی گونجاو و زیندوو پێویستیەکی گرنگی ئەو قۆناغەیە، واتە چوارچێوەو بنەماو ستراتیژێکی تایبەت بۆ ئەم مەسەلە دەبێ هەبێ، بەڵام بەستنەوەی پرسی ئاسایش و ئارامی تەنها بە هێزو چەکداری مومکین نابێ سەرکەوێ، وەك ئەوەی لەگەڵ بەهاری عەرەبی روویدا.

لەبەر ئەوە مەسەلەی ئارامی و ئاسایشی وڵات بەستراوەتەوە بە گەشەی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی شارستانیەت و هێز پێکەوە، چەندەش دۆسیەی ئەمنی سەقامگیرو گونجاو و لەبار بێت، ئەوەندەو بگرە زیاتریش کاریگەری ئەرێنی لەسەر گەشەی وڵات و کیان دەبێ لەهەموو رووێکەوە.

****

# باسی چوارەم
# پێگەو بایەخی ئەمن و ئاسایش

ئیسلام بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی ئەمن و ئاسایش داوەو، بگرە لەهەموو ئایینیە ئاسمانیەکانیش گرنگی زۆرو بەهاو نرخی تایبەتی بۆ دانراوە، چونکە کاریگەری هەمەلایەنەی زۆری بەسەر تەواوی ژیانەوە هەیە

بە درێژایی مێژوو ئەوەی بۆتە زامنی مانەوەو دروستبوونی پەیوەندیە جۆراوجۆرەکان لە نێوان وڵاتان، وە رایەڵەی دۆستایەتی و ئاشتەوایی و پێکەوە ژیانی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و کاری هاوبەش دروست کردووە، بریتی بووە لە هەبوونی ئەمن و ئاسایش، کە هێمای ژیانێکی بەختەوەرو ئاسایی و گونجاوە.

بە پێچەوانەشەوە هەر کاتێ بۆشایی ئەمنی دروست بوو بێ، کاریگەری خراپ و دەرهاوێشتەی سەلبی بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیان و پەیوەندیەکان لێ کەوتۆتەوە.

گرنگی و بایەخی هەبوونی ئارامی و ئاسایش لەناو کۆمەڵگە لەوە دەردەکەوێت، کە ژیان بێ بوونی ئەمن و ئەمان ناڕواتە رێ و کەم و کوڕی و درزو شێواوی زۆری لێ دروست دەبێ، ئەمەش وا دەکات خەڵك لە ژیان و گوزەران و ماڵ و سامان و کیانی خۆی ئەمین نەبێ و، ترس و بیم و دڵەڕاوکێش بڵاو دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بە رێك و پێکی ئەمان و ئارامی هەبوو لەناو کۆمەڵگە، ئەوە خەڵك لەدوو ئاستەوە هەست بە بەختەوەری و لەززەتی ژیان دەکەن:

## یەکەم: لەسەر ئاستی تاك

ئەمن و ئاسایش گرنگترین هۆکاری ژیانی مرۆڤە، لەبەر ئەوەی هیچ جوڵە و هەنگاوێك بێ بوونی ئەو نیعمەتە ناکرێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەخۆی ئەمین بوو، وە هەستی بە ئارامی ژینگەو

کۆمەڵگەکەی کرد، ئەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانی کارەکانی خۆیی ڕایی بکات و چالاکی ڕۆژانەی ئەنجام بداو، دەوام و کاری بازرگانی و تەنانەت جوڵانەوەکانی بەئاسانی بکات[1].

ئیدی ئەو هەست کردنە بە ئەمن و ئەمان لەهزری تاك، هۆکارە بۆ سوودمەند بوونی کۆمەڵگە لە هەوڵ و بەرهەم و کۆششەکانی ئەو تاکە، چونکە کار دەکاو کارکردنیش بەرهەمی خۆی هەیە، ئەمەش بۆ کۆمەڵگە جێی سوودە، بەلاّم ئەگەر بەهۆی نەبوون یان نەمانی ئارامی و ئاسایش نەیتوانی ئەمە بکات، ئەوە وێڕای بێ بەشبوونی کۆمەڵگە لە وزەی تاکەکانی، سێ درزی گەورەش سەر هەڵدەدەن و لەناو کۆمەڵگە دروست دەبن:

**یەکەمیان:** بڵاوبوونەوەی بێ کاری و تەشەنە کردنی دیاردەی لێکترازانی کۆمەڵایەتی.

**دووەمیان:** وەستانی وزەو توانای تاك لەناو کۆمەڵگەو کەمبوونەوەی بەرهەم و دەسکەوت.

**سێیەمیان:** سەرهەڵدانی دیاردەی کۆچ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، بە ئامانجی دۆزینەوەی شوێنێکی ئارام و سەقامگیر.

## دووەم: لەسەر ئاستی کۆمەڵگە

بوونی ئاسایش و ئارامی بۆ کۆمەڵگە فاکتەرێکی سەرەکی و گرنگە لە بەڕێوەچوونی ژیانی کۆمەڵایەتی، چونکە کۆمەڵگە سەرەڕای ئەوەی پێویستی بە کەشێکی ئارام هەیە بۆ بەجێگەیاندنی پەرستشەکان، پێویستی بە مامەڵەی بازرگانی و بازاڕو ئیدارەو شارەوانی و یاساو ڕێکخستنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و ژیانی دراوسێیەتی و خزمایەتی و پرۆسەی هاوسەرگیری و ڕایی کردنی کارە هاوبەشەکان و خوێندن و کارکردن هەیە.

هەموو ئەمانەو تێکڕای چالاکیە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتیەکانی تری مرۆڤیش، بێ بوونی ئەمن و ئارامی ئاسان دەستەبەر نابن، دیاریشە ڕێکخستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و

---

[1] ـ السنن الإلهية: ل/٢٢٩

پێکهاتـەی کۆمـەڵ ئـەرکی سـەرەکیە بـۆ دەسـتەبەر کردنـی ئـەمنی کۆمەڵایـەتی، لەگـەڵ ڕێکخستنی سیستەمی شارو لادێو پێکەوە گرێدانی تیرەو دروست کردنی فکـرەی گشـتی بـۆ ژیان لە ناو یەك نیشتیمان، وا دەکات مەسەلەی ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەرەو پێشەوە ببات.

بایەخی ئەمن و ئاسایش بۆ کۆمەڵگە یەکجار پێویسـتو گـرنگو پەیوەسـتە، کـە بـوونی هەبێ لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بە تایبەتیو قەوارەو کیانی نەتـەوەیی بـە شـێوەیەکی گشـتی، لەبەر ئەوە باری ئەمنی بە سەرەکیترینو گرنگترین داخوازی ژیـان دادەنـرێ، بـێ بـوونی ئـەو نارامیەش هیچ شتێك دەسـتەبەر نـابێ، کەواتـە زەرورەتێکـی حەتمیـە بـۆ ژیـانو پاراسـتنی بەرژەوەندیەکان.

لەو بەشەی دادێ زیاترو وردتر تیشك دەخەینە سەر بایەخی ئیسلام بە ئەمنیەتو پێگـەی ئەو پرسە لە چوارچێوەی دەقەکانەوە.

❊ ❊ ❊

# باسی یەکەم
# ئەمن و ئاسایش لە قورئانی پیرۆزدا

لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز سەرچاوەی سەرەکی ئایینی ئیسلامەو، یاساو ڕێساو نەخشە ڕێ و دەستوورێکی گشتگیرانەی ژیانی سەر زەوی و مرۆڤایەتیە، هەموو شتە گرنگ و هەستیارەکانی تێدا باس کراوە، بە شێوەیەك لەهەموو قۆناغ و سەردەمەکان ئەو باسکردنە کاریگەری خۆی هەیە.

چەمکی (ئەمن_ ئاسایش) یەکێکە لەو پرس و بابەتانەی قورئانی پیرۆز بە بایەخەوە لێی دەڕوانێ و بە گرنگەوە وەسفی دەکات، ئەم وشەیە (الأمن) و لێوەرگیراوەکانی لە چەندین ئایەتی قورئاندا هاتووەو مەبەست لێی ئەو ئەمن و ئارامیەیە، کە خەڵك سوودی لێ دەبینێ و، کارو ژیان و گوزەران و بەرژەوەندیەکانی بەهۆیەوە بۆ ئاسان و دەستەبەر دەبی و لە ترس و دڵەڕاوکێ دوور دەکەوێتەوە، چونکە ئارامی و ئاسایش، یەکێکە لەو نازو نیعمەتە تایبەتانەی خوای گەورە بە کیان و کۆمەڵگەو نەتەوەکانی دەبەخشێت.

ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین، لە چەندین دەقدا خوای کار لەجێ باسی لەو نیعمەتە گەورەیە کردووە، بۆیە لێرەوە بەشێکی ئەو ئایەتانە دەخەینە ڕوو:

قورەیش کە یەکێك بوون لەو گەلانەی خوای گەورە نیعمەتی ئەمن و ئەمانی پێبەخشیبوون، لەگەڵ ئەوەش منەتی ئەو ئارامی و ئەمنەیان بەسەردا دەکات، وە داوایان لێ دەکا بە هۆی ئەو نیعمەتەوە خواپەرستی بکەن و فەرمانی خوا بەجێ بگەیەنن، هەروەکو دەفەرمویّ: (لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ، إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ، فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ، الَّذِي

أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ)[1]، واتە: لەبەر ئەوەی قورەیش هۆگر بووەو خوی گرتووە بەکاروانی زستانەی (یەمەن)و کاروانی هاوینەی (شام) بۆ بازرگانیو (دابین کردنی بژێوی) کەواتە با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە (کەعبە) بپەرستن، ئەو زاتەی لەبرسێتی رزگاری کردنو خۆراکی پێبەخشینو لە ترسو بیمی (جەردەو رێگران) پاراستوونیو ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

لەو روانگەوە نیعمەتی ئەمنو ئارامیو دوور بوون لە ترسو بیمو تۆقاندن، چ لەسەر ئاستی ناوخۆ و ، چ لەسەر ئاستی دەرەوەو نێو نەتەوەیی بێت، هۆکارێکی گرنگە بۆ راپەڕاندنی کارەکانو وەدەستکەوتنی بژێوی ژیانو بوژاندنەوەی بازرگانیو ژێرخانی ئابووری ولآت[2].

ئەم ئەمنو ئاسایشە بووە هۆی ئەوەی، کۆمەڵگەی مەککە پێشکەوتنێکی باش لەرووی کۆمەڵایەتیو ئابووریو بازرگانییەوە بەخۆوە ببینێ، خەڵك لە جموجۆڵو گەڕان بەدوای گوزەرانو بەجێگەیاندنی پەرستشەکان ئاسان بە ئامانج بگات.

لەلایەکی ترەوە دیسان خوای گەورە بۆ بەرچاوخستنەوەی ئەو نیعمەتەو هۆشیارکردنەوەی خەڵك لەبەرامبەر گەورەیی ئەمنو ئەمان روو دەکاتە خەڵکی بێ باوەڕی مەککەو دەفەرموێ: (أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ)[3]، واتە: باشە، خوانەناسانی مەککە هەست ناکەن، نابینن کە چۆن شوێنێکی ئەمینو پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم هێناون، لە کاتێکدا لە دەوروبەریانەوە خەڵکی دەفڕێنرێت، ئایا هەر باوەڕ بە بەتاڵ و ناحەقی دەهێننو هەست بە نازو نیعمەتەکانی خوا ناکەن و سپڵەیی دەکەن؟!

---

[1]- سورة قريش: ١_٤
[2]- التفسير المنير: ب/١٥ ل/٨١٦
[3]- العنكبوت: ٦٧

لە شوێنێکی تری قورئان خوای گەورە باس لە نزاو دوعایەکی باپیرەی گەورەمان حەزرەتی ئیبراهیم دەکا، کاتێ پاڕاوەتەوە یەکەمین شت داوای لەخوای گەورە کردووە، ئەمن و ئەمان برژێنێتە سەر نیشتمان و خاکەکەی، کە ئەمەش ئاماژەیە بەوەی پێغەمبەران داواو دوعای ئەمن و ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانیان کردووە، خوای گەورەش کە ئەمەی باس کردووە بۆ پێدانی جۆرێك لە هۆشیاری بە ئێمەیە لەمەڕ ئەو پرسەو لەبیر نەکردنی دوعای ئەمن و ئەمانە، هەروەك دەفەرموێ: ( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ...)[1]، (یادی ئەوە بکەنەوە) کاتێك ئیبراهیم دوعای کردو وتی: پەروەردگارا دەوروبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بەشارێکی پڕ لە ئاسایش و ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر ببەخشە بەدانیشتوانی،(بەتایبەت) بەوانەی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوە.

یاخود دەفەرموێ: (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ)[2]، واتە: کاتێك ئیبراهیم نزای کردو وتی: پەروەردگارا، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شارو وڵاتەداو خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.

دەرکەوت کە پێغەمبەر ئیبراهیم (درودی خوای لەسەر بێت) لە نێو پاڕانەوەکانیدا دەستی نزای بۆ لای پەروەردگار، بۆ ئەوە بووە خوای گەورە ئاسایش و ئارامی بە وڵات و نەتەوەو دەوروبەری ببەخشێت.

یا کە وەسفی (کەعبە) دەکا، کە ڕووگەی تێکڕای موسڵمانانەو ماڵی خواو شوێنی خواپەرستی و بەجێگەیاندنی فەریزەی حەجە، ئاماژە بۆ هەبوونی ئەمن و ئاسایشی دەکاو، ئەو باس کردنەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی ئەو پرسە لەناو کیان و نەتەوەو نیشتماندا، هەروەك دەفەرموێ: (وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْنًا وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى)[3]، واتە:

---

[1] ـ البقرة: ١٢٦
[2] ـ ابراهيم: ٣٥
[3] ـ البقرة: ١٢٥

(یادی ئەوەش بکەنەوە) چۆن ئەم ماڵەمان (کەعبە) کردە جێگای کۆبونەوەی خەڵکی، کە بەوپەڕی هێمنیو ئاسایشو ئاسوودەییەوە لەوێ بەیەك بگەن (دە ئێوەش، خەڵکینە) مەقامی ئیبراهیم کە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بوو، بیکەنە جێگای خواپەرستیو نوێژ.

یان دەفەرموێ: (وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا)[1]، واتە: ئەوەی بچێتە ناوی (واتە حەرەمی مەککە) پێویستە ئەمینو ئاسودە بێت، لە هەموو دەستدرێژیەك.

لەلایەکی ترەوە خوای بالاّ دەست دەفەرموێ: ( وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ)[2]، واتە: خوا نموونەی هێناوەتەوە (بە دانیشتوانی) شارێك کە ژیانیان بە هێمنیو ئاسوودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە رزق و رۆزی جۆراو جۆریان بۆ دەهات (بەڵام لە جیاتی سوپاسگوزاریی) ناشوکرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەکانی خوا بوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاکی برسێتیو ترسی کردە کاڵای بالاّیان و تالاّوی نەداریيو ترسی پێ چەشتن لە سەر ئەنجامی ئەو نیش و کارە (ناپوخت و نارێکانەدا) کە دەیانکردە پیشەی خۆیان.

وە ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین، دەبینین لە چەندین ئایەتی تردا وشەی (ئەمن)ی باس کردووە، کە هەر یەکەو پێویستی بە لەسەر وەستانی زۆر هەیە، بەڵام لەبەر درێژ نەبوونەوەی باسەکە تەنها بە کورتی دەیانخەینە روو:

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا)[3]، واتە: ترسو بیم بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کاری چاکە دەکەن، دەگۆڕێت بەئارامیو هێمنی.

---

[1]- آل عمران: ٩٧
[2]- النحل: ١١٢
[3]- النور: ٥٥

هەروەها دەفەرموێ (وَقَالَ ادْخُلُوا مِصْرَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ)[1]، واتە: پێغەمبەر یوسف بە خزمانی خۆی وت: ئەگەر خوا ویستی بێت بەیەکجاریی وەرن بۆ میسرو، بەوپەڕی شادیو ئارامیو کامەرانی نیشتەجێ بن.

وە دەفەرموێ: (وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ)[2]، واتە: ئەوسا ئێمە لە نێوان ئەهلی (سبا) کە لە یەمەن بوون، لەگەڵ ئەو شوێنانەدا (مەملەکەتی شام) کە بەرەکەتمان بەسەردا رژاندبوون، دێهاتو ئاوەدانی ئاشکرامان بەرپا کردبوو، کە بەبێ ماندوو بوون ئەوان سەفەریان دەکرد (لە نێوان شامو یەمەندا) ماوەی نێوان دێهاتەکانیان دەبڕی بە ئاسانیو بێ ماندوو بوونو (پێمان وتبوون، دە سەفەرو بازرگانی بکەن)، بڕۆن چەندەها شەو و رۆژ بێ ئەوەی هیچ ترسو بیمتان هەبێت.

لە ئایەتێکی تردا فەرمویەتی: (وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا آمِنِينَ)[3]، واتە: ئەوانە لە چیاکاندا خانووبەرەیان دەتاشیو، بەئارامیو ئاسودەییەوە ژیانیان تێدا دەبردە سەر.

یان دەفەرموێ (أَفَمَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[4]، واتە: باشە، ئەوەی فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە چاکترە، یان ئەو کەسەی کە بەدڵنیاییو ئارامیو هێمنیەوە دێت لە رۆژی قیامەتداو بەرەو بەهەشت بەڕێزەوە بەرێ دەکرێت؟!

یاخود دەفەرموێ: (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ)[5]، واتە: هەر کاتێك هەواڵێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایشو هێمنایەتی، یاخود ترسو بیم، بڵاوی دەکەنەوە.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین، کە خوای گەورە یەك لە خۆشیو سیفاتەکانی بەهەشتی بە ئەمنو ئەمان ناوبردووە، هەروەکو دەفەرموێ: (ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ آمِنِينَ)[1]، واتە: پێیان دەوترێت:

---

[1]- یوسف: ٩٩
[2]- سبا: ١٨
[3]- الحجر: ٨٢
[4]- فصلت: ٤٠
[5]- النساء: ٨٣

فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی‌و سەلامەتان لەسەر بێت، ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی‌و ئارامی‌و هێمنی تیادا بەرنە سەر.

سەرجەمی ئەو ئایەتە پیرۆزانە، کە باس لە چەمك‌و بایەخی هەبوونی ئەمن‌و ئاسایش دەکەن، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە مەسەلەی ئاسایشی نەتەوەیی بەپێی دەقە قورئانیەکان بابەتێکی گرنگەو پێویستیەکی دانەبڕاوی ژیانە، لەگەڵ ئەوەش هێمایە بۆ بەرچاو روونی ئێمەی مرۆڤ، کە نیشتەجێی سەر ئەو زەویەین‌و، ئەرکی ئاوەدانی زەویمان پێ سپێرداوە، بەردەوام هەوڵ‌و کۆشش بکەین، بۆ ئەوەی بۆ لایەنی دەروونی‌و ئیمانی‌و دونیایی‌و دوا رۆژ، ئارامی‌و ئەمن‌و ئاسایش‌و سەقامگیری پەرە پێ بدەین، وە رێگە بە هیچ کارو کەس‌و کیانێك نەدەین ئاسایشی نەتەوەیی‌و نیشتمانی بخاتە بەر مەترسیەوە.

❊❊❊

[1]- الحجر: ٤٦

# باسی دووەم

# چەمکی ئاسایش لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ)

خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە، بۆ ئەوەی پەیامی ئاسمان بە زەوی بگەیەنن، وە مرۆڤایەتی رزگار بکەن و ژیان و هەوڵ و هەنگاویان بە ئاراستەی رێکی و چاکی و پاکی بەرن، بۆیە دەکرێ بڵێین: یەکێ لە مەهام و پەیامی تێکڕای پێغەمبەران دەستەبەر کردنی ئۆقرەیی و ئارامی مرۆڤ و کۆمەڵگە بووە، تەنانەت فەلسەفەی ناردن و هاتنی پەیامە ئاسمانیەکان، بۆ ئەوە بووە ئارامی مرۆڤایەتی لەسەر زەوی بەرپا بێت و، خەڵك لە ژیانێکی ئاسوودە و بەختەوەر بژێت.

ئەگەر سەیری فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بکەین، ئەو راستیەمان بۆ دیار دەکەوێت، کە لە چەندین فەرمووددەوە ئامــاژەی راســتەوخۆ و ناراستەوخۆ بە ئەمن و ئەمان و ئاسایشی کیان و نەتەوە کراوە، چونکە ئەو پرسە دوای نیعمەتی ئیمان و ئیسلام بە یەکێ لە گەورەترین خەڵاتەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی و لەناو کۆمەڵگەکان هەژمار دەکرێ.

لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (**مَن أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ له الدُّنْيَا**)[١]، واتە: هەر کەسێك لە ئێوە بەیانی زوو هەڵسا لاشەی ساغ بوو، وە لە ناو ماڵی خۆیدا ئەمین و ئارام بوو، خواردنی ئەو رۆژەی هەبوو، ئەوە وەکو ئەوە وایە هەموو دونیا موڵکی ئەو بێت.

بە پێیەی ئەو فەرمودەیە ئەگەر مرۆڤ لەخۆی و ماڵ و رزق و تەندروستی و ژیانی دڵنیا و ئەمین بوو، وە هەستی بە ئارامی و سەقامگیری کرد، ئەوە رێك وەکو ئەوە وایە کە مرۆڤ

---

[١]- سنن ابن ماجة: ب/٢ ل/١٣٨٧

پادشاو خاوەنی هەموو دونیا بێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر مرۆڤ خاوەنی هەموو دونیـا بێـت، بەڵام ئاسایش و ئارامی لەدەست دا، ئەوە وەکو ئەوەی وایـە هیچـی نـەبێت، کەواتـە ئـەمن و ئاسایش پێویستیەکی بنەڕەتیە بۆ بـەردەوامی ژیـان و ئـاوەدانی زەوی، وە نـەمانی ئـەمانیش دۆخی ئاسایی دەشێوێنیّ و ترس و دڵەڕاوکێ و شڵەژان دروست دەکاو، کارو گوزەران لە بەرهـەم هێنان دەوەستێنیّ و، وای لیّ دیّ ژیان بیّ بوونی ئەمن و ئاسایش هیچ نرخ و بەهایەکی نەمێنیّ.

هەروەها پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) هەمیشـە لـەکارو هـەنگاوەکانی ئـەو بنەمایەی رەچاو کردووە، کە ئارامی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تێدا بێت، وە قەدەغەی هەر کارو هەنگاوێکی کردووە، کە ببێتە هۆی تێکشکانی ئارامی، بۆیە یەکیّ لە نزاو پاڕانەوەکانی ئەوە بوو دەیفەرموو (**اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي وَآمِنْ رَوْعَاتِي**)[1]، واتە: خوایە عەیب و عارم داپۆشە، خوایە لە ترس و تۆقین بمپارێزەو ئەمانم پیّ ببەخشە.

لە لایەکی ترەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئاماژەی بەوە کردووە، کە رەوا نیـە تەنانەت مرۆڤ ئاسایشی تاکە کەسـێك بخاتـە مەترسـیەوە! وەنـابیّ مرۆڤـی موسـڵمان بەهـەر هۆیەکەوە بێت خەڵك بترسێنیّ و دڵـەڕاوکیّ لـەناویان بنێتـەوە، وەك لـەو فـەرمودەی هـاتووە دەفەرمویّ: (**لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا**)[2]، واتە: دروست و رەوا نیە بـۆ مرۆڤـی موسـڵمان موسڵمانێکی تر بترسێنیّ.

لە فەرمودەیەکی تر دەفەرمویّ: (**لَا يُشِيرُ أحدكم على أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ فإنه لَـا يَـدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ ينزغ فِي يَدِهِ فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ من النَّـارِ**)[3]، واتە: هیچ یەکیّ لە ئێوە ئاماژە بە چـەك بـۆ برای خۆی نەکات، چونکە ئەو نازانیّ نەبادا شـەیتان زەفـەری پـیّ ببـاو لەدەسـتی دەربچـیّ و بەهۆیەوە بچێتە ناو ئاگرەوە.

---

[1]- صحيح ابن حبان: ب/٣ ل/٢٤١
[2]- سنن أبي داود: ب٤/ ل/٣٠١
[3]- صحيح البخاري: ب/٦ ل/٢٥٩٢

لەوەش زیاتر لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) خەڵکێکی داناوە بۆ پارێزگاری‌و چاودێری کردن‌و پاراستنی باری ئەمنی خەڵك، هەروەها کەسی تایبەتی دیاری کردووە بۆ ئەوەی ئاسایشی ولات بپارێزێ، وەك لەو فەرمودە هاتووە کە دەفەرموێ: (عن أنسٍ أن قَيْسَ بن سَعْدٍ كان يَكُونُ بين يَدَيْ النبي ﷺ بِمَنْزِلَةِ صَاحِبِ الشُّرَطِ من الْأَمِيرِ)[1]، واتە: ئەنەس دەگێڕێتەوە کە قەیسی کوڕی سەعد (رەزای خوای لێ بێ) لەبەر دەستی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) بەڕێوەبەری ئاسایش بووە.

هەر بەمەبەستی پاراستن‌و چاودێری باری ئەمنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کەسێکی بەتوانای وەك ئیمامی عومەری کوڕی خەتابی وەك بەرپرسی بازاڕی شاری مەدینەو، سەعدی کوڕی سەعیدیشی وەك بەرپرسی بازاڕی شاری مەککە دیاری کرد[2].

لەسەردەمی دوای ئەویش خەلیفە بەرێزەکانی ئیسلام چاودێرو کەسی شارەزایان بۆ ئەو مەبەستە دیاری کردووە، تا دۆخی ئەمنی کۆمەڵایەتی‌و بازرگانی خەڵکی نەکەوێتە بەر مەترسی‌و ترازانەوە.

ئەوەتا ئیمامی ئەبوبەکری سدیق لەسەردەمی خەلافەتیدا فەرمانی دەرکرد، کە عەبدوللای کوڕی سەعید لەشەودا بەناو کوچەو کۆڵان‌و شاردا بگەڕێت، بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی خەڵك‌و ناوچەکە[3].

تەنانەت کاتێ ئەبوبەکری صدیق بووە خەلیفەی موسڵمانان، یەکێ لە کارەکانی ئەوە بوو، کە دەستەڵاتی دادوەری وەك دامەزراوەیەکی سەربەخۆ جیا کردەوەو (عومەری کوڕی خەتاب)ی کردە دادوەر، وە لەسەردەمی خەلافەتی عومەردا (رەزای خوای لێ بێ) سەربازگە دروست کراو، تەنانەت هێزو سوپای لە خەڵکی مەدەنی جیا کردەوە، لەگەڵ ئەوەش چەندین دیوانی

---

[1]- صحيح البخاري: ب/٦ ل/٢٦١٦
[2]- الشرطة في نظام الاسلام / مقالة.
[3]- النظم الأسلامية: ل/٢٠٨

تایبەتی دامەزراند، وەك دیوانی ناو نووسکردن و دیوانی سەربازی و دیوانی بەیتولمال و دانانی بەرپرس بۆ میحوەرە جیا جیاکان[1]، ئەمانە هەمووو بۆ ئەوە بووە بتوانن سیستەمی ئیداری و سیاسی و کۆمەڵایەتی رێك بخەن و، کۆنترۆڵی ئەمن و ئاسایشی خەڵك و خاك و کۆمەڵگەی ئەوسا بکەن.

لە سەردەمی (ئەمەویەکان)دا هێزی پۆلیس و پاراستن بۆ چاودێریکردنی کەسانی گومان لێکراو بە سەرپەرشتی (زیادی کوری قەیس) تۆکمەو فراوان کرا، وە دامەزراوەیەکیان دامەزراند بەناوی (نظام مراقبة المشبوهين) واتە: سیستەمی چاودێریکردنی کەسانی گومان لێکراو، دواتر هەستان بە دروستکردنی (البطاقة الشخصية) کە وەك (هەویەی باری کەسێتی) وابوو، هەر کەسێك دەبوایە لە کاتی رۆیشتن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، یان لە کاتی سواربوونی کەشتیدا ئەم کارتەی پێ بوایە، ئەگینا بەند دەکرا، لە کاتی پێویستدا رێگە درابوو هێز بەکار بێنن بۆ کۆتایی هێنان بە ئاژاوەو پشێوی و یاسا شکێنی لەلایەن خەڵکەوە[2].

بۆیە دەکرێ بڵێین ئیسلام زۆر پێشکەوتوو بووە، لە دانانی سیستەمی گونجاو بۆ پارێزگاری دۆخی ئەمنی خەڵك و ئاسایشی وڵات، وە پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) رێکاری زۆری گرتۆتە بەر بۆ ئەو مەبەستە، چونکە وێرای ئەو فەرمودانەی سەرەوە، دەیان فەرموودەی تر هەیە، کە زامنی سەقامگیری کۆمەڵگەو ئاسایشی نەتەوەیین، دەکرێ لێردا هەندێکیان وەك نمونە بێنینەوە..

لەبارەی رێسا و مافی دراوسێیەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: **(والله لَا يُؤْمِنُ والله لَا يُؤْمِنُ والله لَا يُؤْمِنُ قِيلَ وَمَنْ يا رَسُولَ اللَّهِ قال الذي لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بوائقه)**[3]،

---

[1] - ئیسلام و سیاسەت: ل/٥١

[2] - پەیامی زانایان: ژمارە/٧٦

[3] - صحيح البخاري: ب/٥ ل/٢٢٤٠

واتە: سێ جار فەرمووی سوێند بەخوا ئیمانی تەواو نیە. گوتیان کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی دراوسێیەکەی لێی ئەمین نیە.

کە دەکرێ ئەمە بە بەڵگەیەکی گرنگ لەقەڵەم بدرێ، سەبارەت بە دروست کردنی خاڵی سەرەتاو بنەڕەتی کۆمەڵگەی ئارام، چونکە مەعلومە ئەگەر مافی دراوسێیەتی رەچاو کراو خەڵکی شار بە تێکڕا بوونە مایەی ئەمان بۆ یەکتری، ئەوە دۆخی ئەمنی سەلامەت و ئارام دەبێ. یان ئاماژە بەوە دەکا، کە نابێ موسڵمان جێگەی مەترسی بێت بۆ هیچ کەس و لایەنێك، وە نابێ زیان بە دەوروبەری خۆی بگەیەنێ، هەروەکو دەفەرموێ: (الْمُسْلِمُ مَن سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ من لِسَانِهِ وَيَدِهِ)[1]، موسڵمان ئەو کەسەیە، کە موسڵمانان لە خراپەو زیانی دەست و دەمی پارێز راو بن.

یاخود دەفەرموێ: (من حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا)[2]، واتە: هەر کەس چەك لە دژمان بەکار بێنێت ئەوا لە ئێمە نیە. کە ئەمە هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسانەی چەك لە دژی موسڵمانان بەکار دەهێنن و ترس و بیم دەخەنە ناو کۆمەڵگەوە.

ئیدی دەگەینە ئەو راستیە، کە چەمکی ئاسایش لە فەرمودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هاتوەو بایەخی زۆریشی پێ دراوە، ئەمەش وا دەکا ئێمەی موسڵمان لەمەڕ گرنگی ئەو پرسەو بەرپرسیارێتی ئەو بوارە هۆشیار بین، بۆ ئەوەی لایەنگری هێنانەدی و دەستەبەرکردنی ئاسایشی نەتەوەیی بین، لەپاڵ ئەمەش چاودێرو کاراکتەری بەهێزی پاراستنی ئەو نیعمەتە مەزنە بین، کە خوای گەورە بە ژین و ژیارو ژینگەی دەبەخشێت.

***

[1]- صحيح البخاري: ب/١ ل/١٣

[2]- صحيح البخاري: ب/٦ ل/٢٥٢٠

# باسی سێیەم
# گرنگی و پێگەی ئاسایش و ئارامی لە فیقهی ئیسلامیدا

یەکێ لە ئامانجە سەرەکیەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕەچاوکردنی لایەنی بەرژەوەندی مرۆڤەکانە، چونکە ئیسلام سەرجەم پێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤی دەستەبەر کردووەو، چەندین ڕێسای تایبەتیشی بۆ ئەو مەبەستە داناوە تا پارێزگاریان لێ بکات، لەو ڕوانگەوە زانایانی فیقهی ئیسلامی بەهەڵێنجانی چەندین یاسا لە دەقەکانی هەردوو سەرچاوە سەرەکیەکەی ئیسلام، سەرجەمی ڕێکارو مەنهەجە فیقهیەکانیان لە پێناو بەرچاو ڕوونی مرۆڤو پاراستنی بەرژەوەندیەکانی و بە پێی مەقاسیدی شەریعەت داڕشتووە[1].

پاراستنی بنەماکانی ژیانی هەر مرۆڤێك لە تێڕوانینی ئیسلام، ئەرکێکی گرنگو پێویستو واجبێکی حەتمی هەر تاکێکە، لەبەر ئەوەشە زانایانو فیقهناسان ئەو بنەمایانەیان بە پێنج شتە پێویستەکان (الضرورات الخمس) ناو بردووە[2]، ئەوانیش بریتین لە پاراستنی: (دینو، ژینو، ژیریو، ئابڕوو، ماڵو سامان)، کەواتە ئەمنو ئارامی زەروروتێکی هەمیشەییە بۆ بەدیهێنانی ئەم مافە بنەڕەتیانەی تاكو کۆمەڵ، بۆ ئەو مەبەستە ئیسلام لەم پێناوەدا کار دەکاتو، گرتنە بەری هەموو ڕێساو جەنگو جیهادێکیش بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەیە.

لێرەدا بۆ بەرچاو ڕوونی پتری خوێنەرو قسەکردن لەسەر گرنگی پاراستنی ئەو (پێنج بنەما زەروریانە)[3]و کاریگەریان لە دروستبوونی ئەمنو ئارامی، ئەگەر بە کورتیش بێ تیشکیان دەخەینە سەر:

---

[1]- ضوابط المصلحة: ل/١٣١
[2]- السياسة الشرعية: ٨٧
[3]- الوجيز في أصول الفقه: ل ٣٧٩

## یەکەم: پاراستنی دین

ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك زەرورەتێکی ژیان و هێشتنەوەی ئارامی دەروونی و ئیمانی داوا دەکا دین پارێزراو بیّ و کەس سوکایەتی پیّ نەکات، بۆ ئەو مەبەستەش لەپێناو پاراستنی دین، ئیمان هێنان و بەجێگەیاندنی روکنەکانی ئیمان و ئیسلامی بە ئەرك گیّراوە، چونکە بەوە هەست و نەستی دیندارانەی خەڵك سەلامەت دەبیّ و کۆمەڵگەش لەرووی دینداریەوە ئارامی و نۆقرەیی وەردەگرێت و، بەشێوەیەکی تۆکمەوە کاروبارەکان بەرێوە دەچن[1].

وە سزای توندی داناوە بۆ ئەوانەی لە رێی گومان دروست کردن و تەحریفکردنی بەرنامەو رەشکردنەوەو هەڵگەڕانەوەو گرتنەبەری رێوشوێنی نەگونجاو بۆ شێواندن و شکاندنی سوکایەتی بەدین دەکەن.

تایبەت لەو پێناوەشدا یاسای هەڵگەڕانەوە لەدین (الردة) دانراوە، کە تێیدا بە پێی دەقی فەرمودە، ئەو کەسەی دینی خۆی دەگۆرێت پێویستە لە تۆڵەی ئەو تاوانە بەسزای دیاریکراوی خۆی بگات، بۆ ئەوەی ئاسایشی دینداری خەڵك نەکەوێتە بەر مەترسی و سوکایەتی پێکردن و لەناو چوونەوە.

## دووەم: پاراستنی گیان و ژین

بۆ پاراستنی نەفس و ژیان، ئیسلام هەموو جۆرە دەستدرێژیەکی بۆ سەر ژیانی خەڵك و رشتنی خوێن حەرام کردووە، وە لێپێچینەوەو سزای توندی دونیایی و قیامەتی بۆ ئەو کەسانە داناوە، کە هێرش دەکەنە سەر ژیانی خەڵك و خوێنیان بە ناهەق و ناڕەوا دەرژێنن.

---

[1] ـ المقاصد الشرعية وأثرها في الفقه الاسلامي: ل/١٧٤

بۆیە لە ئیسلامدا ئەگەر کەسێك کەسێکی تر لەناو ببـاو گیـانو ژیـانی لێ بسـتێنێتەوە، ئەوە دەبێ لە تۆڵەدا بکوژرێتەوە، بۆ ئەوەی ژیان بۆ کۆمەڵگە بگەڕێتەوەو، خەڵك بە سووكو سانا دەست بۆ ئەو جۆرە تاوانە گەورانە نەبات، ئەگەر ئەمەش جێبەجێ کرا، ئەو کات گیـانو ژیانی خەڵك سەلامەتو پارێزراو دەبێت، ئەوەش هۆکـارێکی گرنگـە لەمـەڕ بەقـەرار بـوونی ئەمنی قەومیو، دڵنیا بوونەوەی خەڵك لە سەلامەتی ژیانو گیانی خۆیان.

## سێیەم: پاراستنی عەقڵ_ ژیری

عەقڵ نیعمەتێکی گەورەی خوایـەو بـە مرۆڤـی بەخشـیوە، وەك تایبەتمەندیـەکی مـرۆڤو پێوەری تەکیلفی شەرعی دیاری کراوە، وە ئیسلام دەیەوێ هەمیشە ئەو عەقڵە پـارێزراو بـێو کەس سوکایەتیو هەڕەشەی لێ نەکات، بۆ ئەو مەبەستەش شـەریعەتی ئیسـلام هـەموو ئـەو کردانەی حەرام کردووە، کە دەبنە مایەی مەترسی نەمانو لاوازبوونو تێکچوونی عـەقڵ، وەك خواردنەوەی عارەقو بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان، چونکە ئەوانە تاوانو زیان بە عـەقڵ دەگەیەننو، پێویستە لەسەر کردنیان بکەرەکەی سەرکۆنە بکرێت[1].

لەهەمان کات سزای داناوە بۆ ئەوانەی دەست بۆ بەزاندنی ئەو سنوورە دەبەن، بەوەی دەبێ داری حەدیان لێ بدرێت، چونکە هەرکات ئەو حوکمە جێبەجێ کراو کەسی سەرخۆشو بێهۆش سزای تاوانەکەیان وەرگرت، خەڵك کەمتر روو لەو دیاردە دەکەنو ئەو کات بیرو هۆشو عەقڵی خەڵك ساغو سەلامەتو ئارام دەبێت.

[1]- السیاسة الشرعیة: ل/٣١٢

## چوارەم: پاراستنی وەچەو ئابروو

لەوەشدا ئایینی ئیسلام بۆ سەلامەتی وەچەو پارێزگاری لەشەرەف و ئابروو، پرۆسەی هاوسەرگیری و دروست کردنی خزمایەتی شەرعی داناوە، لە بەرامبەر ئەمەش زیناو تێکەڵاوی ناشەرعی و قەدەغەکردنی منداڵبوون و لەباربردنی حەرام کردووەو، سزای توندی بۆ بکەرانی ئەو تاوانانە دیاری کردووە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کۆمەڵگە لەرووی قیەمی ئەخلاقیەوە تووشی شڵەژان و نائارامی و تێکەڵاوی وەچەو شکاندنی کەرامەتی مرۆڤو پەیدابوونی منداڵی بیژی و نەخۆشیە جنسیەکان نەبێت.

بۆ ئەو مەبەستە ئەگەر سزای شرواڵ پیس و زیناکار جێبەجێ کرا، ئەوە دەبێتە هۆی پاراستنی ناموس لە لایەك و، حورمەتی خەڵك و ئارامی کۆمەڵایەتیش پارێزراو و بەرقەرار دەبێ لەلایەکی ترەوە.

## پێنجەم: پاراستنی ماڵ و سامان

لەپێناو برەودان و گەشەسەندنی لایەنی گوزەران و ئابووری و ماڵ و سامانی خەڵك، ئیسلام کڕین و فرۆشتن و کاری بازرگانی و بازارو مامەڵەی لەچوارچێوەی رەچاوکردنی بنەمای حەلالی و حەرامی دیاری کردووە، لە بەرامبەریشدا دزی و جەردەیی و رێگری و بەهەدەردان و لەناو بردنی ماڵ و سامانی خەڵکی حەرام و قەدەغە کردووە، وە سزای (دەست بڕین)ی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە دزی دەکەن و ماڵی خەڵك بەنارەوا پەنهان دەکەن، ئەمەش بۆ ئەوەیە رێگری لە تاوانی دزی بکرێ، تا ئەمن و ئارامی خەڵك نەشوێندرێ و پشێوی لەناو کۆمەڵگە نەکەوێتەوە.

ئیدی هەر کات ئەو سزاو تۆڵەیە بەرامبەر دزو چەتەو رێگر ئەنجام درا، ئەوە هەم دیاردەی دزی کەم دەبێتەوە، هەمیش خەڵك بە ئاسانی و لە دۆخێکی هێمندا دەتوانێ کاری بازرگانی بکاو، لە ماڵی خۆی ئەمین بێت و کاروانچی و رێبوارانیش لە کەشێکی ئارامدا گوزەرانیان بەرێ بکەن.

لەبەر ئەوە هیچ کەسێك ناتوانێ بێ ئەمین بوون لەو (پێنج مەقاسیدە) ژیان بەسەر بەرێت، سەلامەتی دین و نەبوونی هەڕەشە لەسەر عەقڵ و گیان و سەروەرت و سامان و لایەنی شەڕەف، وا دەکا مرۆڤ هەست بە جۆرێك لە ئارامی ژیان لەناو نەتەوەو نیشتمانەکەی بکات، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرقەرار بوونی پتری ئەمن و ئاسایشی وڵات و دروستبوونی متمانەو، کەوتنە سەر پێی ژێر خانی ئابووری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی. بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەموو جوهدێکی لەپێناو پاراستنی ئەو بنەما گرنگانەیەو، تێکڕای سەرچاوە فیقهی و فیقهناسانیش بەئاراستەی سەلامەتی ئەو مەقاسیدانە شرۆڤەی بۆچوونەکانیان کردووەو ئامانجیان بووە، پەیامی شەریعەت و قورئان و سوننەت لەوەدا بەجێ بگەیەنن.

ئەگەر سەیری ڕێساکانی ئوسولی فیقهو بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بکەین، کە زۆرینەی یاساکانی لە بازنەی ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیە باڵاکانی ژیانی مرۆڤو، دانانی چوارچێوەیەك بۆ پاراستن و داکۆکی لێ کردنیان دەخولێنەوە، دەگەینە ئەو ڕاستیە کە ئامانجەکە تەنها بۆ دروستبوونی هۆشیاری پێویستە لەمەڕ بنەماکانی شەریعەت، کە هۆکارێکی سەرەکیە بۆ هێنانەدی ئارامی کۆمەڵگەو ئاسایشی نەتەوەیی.

لەلایەکی تریشەوە ڕێگە نەدراوە بە هیچ کەس، دەست درێژی بکاتە سەر ئەو بنەما گرنگانەو بگرە هەر بە پێی ڕێسا فیقهی و شەرعیەکان[1]، دروست نیە مرۆڤ ستەم لە خۆی بکا، یان کاری بەدڕەوشتی ئەنجام بدا، یان ماددەی هۆشبەرو سڕکەر بەکار بێنێ، یان ماڵی خۆی بەهەدەر بدات، بەهەمان شێوە ڕێگە نەدراوە ئەو تاوانانە بەرامبەر کەسیش ئەنجام بدات.

لەو پێناوەش ئیسلام سزای توندی بۆ ئەو کەسانە داناوە، کە ئەو سنورانە دەبەزێنن و، ئارامی خەڵك و کۆمەڵگە دەخەنە ناو پشێوی و هەڵچوون و دڵەڕاوکێ و شکاندنی قیەم و داب و سنوورو بەهای مرۆییەوە.

[1] - المقاصد الشرعية وأثرها في الفقه الاسلامي: ل/١٨٧

# باسی چوارەم
# ئەمن و ئیمان دوو چەمکی پێکەوە گرێدراو

ئیمان بناغەی ئەمن و ئارامیە، لە بنەڕەتدا وشەی ئیمان لە ئەمنەوە وەرگیراوە، چونکە ئەگەر ئیمان بریتیێ بێ لە رازی بوون بە فەرمانی خواو ملکەچی نواندن و دەروون هێورەیی و ئۆقرەیی، ئەوە ئەمنیش بریتیە لە هەست کردن بە ئارامی دەروون و دەوروبەر، کەواتە هەم لە رووی دەربڕینەوە هەم لەرووی واتاو ناوەڕۆکەوە لێکەوە نزیکن، بە شێوەیەك چەندە مرۆڤ لەرووی ئیمانیەوە دامەزراوو لەپێش بێت، ئەوەندەش لەرووی دەروونی و ئەمنیەوە دڵنەوایی بۆ دروست دەبێ، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)[1]، واتە: ئەوەی ئیمان و باوەڕ بهێنێت وچاکسازی بکات، ئەوە نەترس و بیمیان لەسەرە، نە غەمبار دەبن.

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) پەیامێکی گرنگ لەو بارەوە دەخاتە روو، بەوەی ئیماندار بەوە پێناسە دەکرێ و دەناسرێتەوە، کە بۆ دەروبەری خۆی ئەمین و ئارام بەخش بێ، هەروەك دەفەرموێ: (الْمُؤْمِنُ من أَمِنَهُ الناس على أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ)[2]، واتە: ئیماندار ئەو کەسەیە، کە خەڵکی لە سەرو ماڵیان لێی ئەمین بن.

هەر لەبەر ئەو گرنگی و لێك نزیکی هەردوو چەمکی ئەمن و ئیمانە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەڵێنی بە ئیمانداران داوە، کە ئەمن و ئەمانیان بۆ فەراهەم بکا، بەو مەرجەی ئیمانداران خۆیان بیانەوێ ئاسایش و ئارامی خۆیان لەبەر چاو بگرن، بەوەی رێی هیدایەت

---

[1]- الأنعام: ٤٨

[2]- سنن ابن ماجة: ب/٢ ل/١٢٩٨

بکەنە ئامانج و تەقوا و خۆپارێزی بکەن و راستی و ناراستی لێك جیا بکەنەوە، لەپاڵ ئەمەش دادپەروەری لەنێوان خۆیان دروست بکەن و ستەم و هەموو جۆرە کارێکی نەگونجاو لەخۆیان دوور بخەنەوە.

خوای گەورەو کاربەجێ دەفەرموێ: (الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ)[1]، واتە: ئەوانەی ئیمانو باوەڕیان هێناوەو ستەمو هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسوودەیی و هێمنی و ئاسایش هەر بۆ ئەوانەیە، هەر ئەوانەش رێنموومایی کراون.

یان دەفەرموێ (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)[2]، واتە: خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو، کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لەئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە ولاتدا، هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی رازیە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بەئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بەتەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

کەواتە ئەگەر مرۆڤ لە ئیمان و باوەڕی خۆیدا کەسێکی دامەزرایی و چەسپاو و ئیمان بەرز بوو، وە توانی لەرووی لێپێچینەوەی نەفس و تێکەڵاوی خەڵك و چاودێری کردنی مافی خوا[3]

---

[1]- الأنعام: ٨٢
[2]- النور: ٥٥
[3]- تهذيب مدارج السالكين: ٤٨٦

خۆی کۆنترۆڵ بکا، ئەوە بەتەنکید دەبێتە مایەی بەختەوەری دونیاو دوارۆژی و ئارام بوونی دەروون و دەوروبەروو کیان و کۆمەڵگەی.

هەروەها پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) ئەو راستیەی زیاتر بۆ ئێمە شیکردۆتەوە، کاتێ کە لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی هێمن و ئارامبەخشی مانگە شەوی چواردە، دەستەکانی بەرز کردۆتەوە نزای کردووەو فەرمویەتی: (**اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ وَالسَّلامَةِ وَالإِسْلامِ وَالتَّوْفِيقِ لِمَا نُحِبُّ وَتَرْضَى رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللَّهُ**)[1]، واتە: خوایە ئەو مانگەمان لەسەر هەڵێنە بە ئەمن و ئیمان و سەلامەتی و ئیسلام، بە دەستگرتن و سەرخستن و هاوکاریت بۆ ئەو شتەی پێت خۆشەو لێ رازیت، ئەی مانگ بزانە پەروەردگاری ئێمەو تۆش تەنها خوای گەورەیە.

بەو پێیە ئاسایش لە بنەڕەتدا لە ئیمانەوە هاتووەو بەشێکە لە ئیمان، لەبەر ئەوە پێویستە ئیسلام رۆڵی دیاریکراوی خۆی هەبێت لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاسایش بەهەموو جۆرەکانیەوە، موسڵمانانیش کە پەیڕەوکاری مەنهەجی ئیسلام و هەڵگری ئیمان و دروشمی ئاشتی و پێکەوە ژیان و برایەتین، پێویستە رۆڵی بەرچاویان هەبێت لەم بوارەدا، بەو حوکمەی کە ئەم ئەرکە درێژە پێدەری رێبازی راستەقینەی پێغەمبەری ئیسلام و دەرهاوێشتەکانی ئیمانە.

لێرەوە دەگەینە ئەو راستیە، کە مەسەلەی ئەمن لە چوارچێوەی ئیسلامدا، هەڵقوڵاوی دەرەنجامی ئەو ئیمانەیە کە لەسەر دەستی ئیماندار بۆ کۆمەڵگە بەرهەم دێت، پاراستنی ئەو ئەمن و ئارامیەش هۆکارە بۆ پێشوەچوونی شارستانیەت و گەشەکردنی کۆمەڵگە لەبواری رۆشنبیری و زانستی و ئابووری و فەرهەنگی و ئەخلاقی، سەرەنجام ئەوەش گرنگترین پاڵنەرن، کە دەبنە زامنی مانەوەو بەرقەرابوونی ئاشتی و ئاسایش و ئارامی لە وڵاتدا.

---

[1] ـ صحيح ابن حبان: ب/٣ ل/١٧١

# باسی پێنجەم
# کاریگەری و رۆڵی ئەمن و ئاسایش لە ژیاندا

لە ئێستادا کۆمەڵگاکان بەدەست مەسەلەی تیرۆرو تۆقاندنەوە دەناڵێنن و وە زۆرێك لە وڵاتان بەهەموو هەوڵ و پلان و هێز و شارەزاییان، نەیانتوانیوە لێی دەرباز بن، بۆیە زۆر گرنگە هۆشیاری ئەوە لەناو وڵاتان و بەتایبەت لەناو موسڵمانان دروست ببێ، کە ئیسلام لە ئەسڵدا پەیامی ئاشتی و پاراستنی ئەمنیەت و راگرتنی سەقامگیرییە، نەك توندو تیژی و تیرۆرو تۆقاندن و گێرەشێوێنی و ئاشوب و ئانەوەی پشێوی، لەوەشدا پێویستە ئاین و بەهاکان پێکەوە ببەسترێن و دان بنرێت بە رۆڵی ئاین لە دەستەبەرکردنی ئەمن و رەنگدانەوەی لە ژیانی مرۆڤدا.

خوای گەورە مرۆڤی نیشتەجێی سەر زەوی کردوەو ئەرکی ئاوەدانی پێ سپاردووە، (هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا)[1]، واتە: خوا بەرپای کردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە.

هەروەها دەفەرموێ: (وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ)[2]، واتە: سوێند بەخوا بەراستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ کرد لەم زەویەداو دەستەلاتمان پێبەخشین و جۆرەها هۆکاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندوون (لە خواردن و خواردنەوەو هۆکانی گواستنەوەو پۆشاك و ناومال و ئاوو هەواو... هتد.

نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی و پێ بەخشینی ژیان و ئاوەدانی و فەراهەم کردنی هۆیەکانی گوزەران، یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە بەرامبەر مرۆڤ، وە دەبێ هەموو

---

[1] - هود: ٦١
[2] - الأعراف: ١٠

نیعمەتێکیش نرخی بزاندرێ، چونکە هەموو نیعمەتەکان پێکەوە خۆشیو ئارامیو بەختەوەری بۆ مرۆڤ لە دونیا دروست دەکەن.

خوای گەورە لە قورئاندا لەبەرامبەر پێبەخشینی نیعمەتی ئەمن و ئاسایش منەت بەسەر مرۆڤەکانەوە دەکاو دەفەرموێ: (فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ، الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ)[1]، واتە: با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە (کەعبە) بپەرستن، ئەو زاتەی لەبرسێتی رزگاری کردن و خۆراکی پێبەخشین و لە ترس و بیمی (جەردەو رێگران) پاراستوونیو ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

یان دەفەرموێ: (أَوَلَمْ نُمَكِّنْ لَهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ)[2]، واتە: مەگەر ئێمە شوێنێکی دوور لەستەم و پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم نەهێناون؟ کە جۆرەها بەروبوومی بۆ دێت و لە هەموو نازو نیعمەتێك بەهرەمەندە!

بەپێی ئەو دەقانەی سەرەوە، ئیسلام دەیەوێ ئێمەی مرۆڤ هۆشیار کاتەوە، لەبارەی گرنگیو کاریگەری نیعمەتی ئەمن و ئەمان بەسەر ژیان و جموجۆڵەکانمانەوە، چونکە وەك چۆن لاشە پێویستی بە خواردن و هەڵمژینی هەناسەیە، وەك چۆن جەستە پێویستی بە جل و بەرگ و پۆشاکە، وەك چۆن زەوی پێویستی بە نمەی بارانە، وەك چۆن هەموو جوڵەو هەنگاوێك پێویستی بە کۆشش کردنە، وەك چۆن گەردوون پێویستی بە خۆرە، وەك چۆن جوانی گوڵ پێویستی بە تیشکی رۆژە، بەهەمان شێوەش مرۆڤ پێویستی بە ئەمن و ئاسایشە لە ژیاندا.

بۆیە پێویستە نەتەوەو گەلان، وە تاك و کۆمەڵ هەمیشە قۆناغەکانی ژیانیان لەبەر چاو بگرن و دۆخەکان هەڵسەنگێنن، بۆ ئەوەی سوود لە ئەزموونەکان وەربگرن و کەمێکیش بەهرەو بەخشندەییو فەزڵی خوای میهرەبان بهێننەوە یادی خۆیان، وەك خوای کار لەجێ لە قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو میتۆدە دەکاو دەفەرموێ: (وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ

---

[1] - سورة قريش: ٣-٤
[2] - القصص: ٥٧

تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)[١]،

واتە: یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە ئێوە زۆر کەم و لاواز کراو و بێ هێزبوون لەزەویدا، دەترسان کە خەڵکی بتانڕفێنن (بتانکوژن یان ئازارتان بدەن) جاخوای بالآدەست جێ و ڕێی بۆ سازکردن و بەهێزی کردن بەسەرکەوتن و یارمەتی خۆی و لە رزق و رۆزیی و ناز و نیعمەتە پاکەکان بەهرەوەری کردن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

لەو روانگەوە ئیسلام هەبوونی ئەمن و ئارامی بە فەزڵێکی گەورە دادەنێ، وە بە سەرەکیترین هۆکاری ئۆقرەیی و بەختەوەری مرۆڤ لەژیان هەژماری دەکات، ئەوەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە مەسەلەی ئەمن هەڵقولاوی ئەو دەرەنجام و ئامانجانەیە، کە لەسەر دەستی مرۆڤ بۆ کۆمەڵگە فەراهەم دەبن.

ئایینی ئیسلام لە رێی هاوسەنگی و بیری مامناوەندێتی و بەپێی چوارچێوە بنەڕەتیەکانیەوە، ئامانجیەتی ژیان بکەوێتە ئارامی و شوێنکەوتووانیشی کار بۆ ئارامی بکەن، چونکە ئیسلام وەك چۆن رەچاوی بنەما دینیەکان دەکا، بەهەمان شێوە نەخشەی بۆ ژیان و دەستەبەربوونی ئەمنیەت و سەلامەتی هاوڵاتیان داڕشتووە، بەشێوەیەك هەموو بەش و لایەنەکانی ژیانی رێکخستووە و رێکاری پێویست و بەرژەوەندخوازی بۆ داناوە.

ئیدی کە داوای ئەمن و ئارامی لە شوێنکەوتووانی دەکات، لەبەر ئەوەیە کە ئاسایش وەك نیعمەتێکی خوایی، هەم پێویستە بۆ ژیان، هەمیش کاریگەرە لە بەرێوەچوونی کار و چالاکی و جموجۆڵە مرۆییەکان و تەنانەت ئەرکە ئاینیەکەشەوە.

هەر کاتیش کۆمەڵگە هەستی بە ئەمان و هێمنی کرد، ئەوە سەرەتای پێشکەوتنی گەورەیە و، سیمای شارستانیەت و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و مرۆیی بەسەر جەستەی کۆمەڵگەوە دەردەخا.

---

[١] ـ الأنفال: ٢٦

هەر بە سروشتیش مرۆڤ حەز بە هێمنی ئارامی دەکات، بۆ ئەوەی رێزو بەهای مرۆڤ بوونو کەرامەتو نرخی لەو بوونەدا پارێزراو بێ، لەلایەکی ترەوە هەر بە ئەزمونو تێڕوانینی لۆژیکیەوە دەرەکەوێت، کە هیچ ئامانجێك بێ قەوارەی ئەمنی سەرناگرێو ناچێتە واری پراکتیکیەوە، بەڵکو گشت ئامانجو خۆشیو کامەرانیەکان دەبنە بلقی سەر ئاوو و دەپوکێنەوە.

هەبوونی ئەمنو ئاسایش لەناو هەر کیانو وڵاتێك، کاریگەری راستەوخۆو هەمەلایەنەو یەکجار زۆرو باشی لە سەر رەوشی ژیان دەبێ، بەهۆیەوە مرۆڤ هەست بە ئۆقرەیی دەکاو کۆمەڵگەش لەزۆر رووەوە سودو قازانجی پێ دەگات[1]، لەوانە:

**یەکەم:** ژیان دەکەوێتە خۆشیو ئارامیو بەشێوەیەك تاکەکان هەست بە لەززەتی نیعمەتەکان دەکەنو خۆشیو رەفاهیەت بڵاو دەبێتەوەو، بە ئاسایيو دوور لە ترسو بیم گوزەرانی هاوڵاتیان بەرێوە دەچێ.

**دووەم:** بواری شارستانیەت پێشکەوتنی بەرچاو بەخۆیەوە دەبینێو زەمینەی کارو پرۆژەو هەنگاونانو بایەخدان بە سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان پەرە دەستێنێو، بەرژەوەندیە گشتیو باڵاکان پارێزراو دەبن.

**سێیەم:** لەرووی ئابووریو گەشەی کۆمەڵایەتیو ئاوەدانيو پێشخستنی وڵاتو دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانی ژیان، کۆمەڵگە دەکەوێتە بارێکی باشو رەوشێکی ئیجابیەوە.

---

[1] - قضية الأمن فى الواقع الإسلامى: ١٨

**چوارەم:** سیستەمی خێزانیو جۆری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانو بەهای رێزو تەباییو برایەتیو پرۆسەی پەروەردەو خوێندنو پێکەوەژیانو هەلی کارو، رایی کردنی کاری رۆژانەو پلانو ئامانجە کەسیو تایبەتیەکان، دەکەونە یەکو، زەمینەی باشو لەبارەیان بۆ دەرەخسێو پێشوەچوونی زۆرو بایەتیانە بەخۆیەوە دەبینن.

**پێنجەم:** مافە گشتیو تایبەتیەکان پارێزراو دەبنو خەڵك بە ئاسانی دەتوانێ مومارەسەی مافە بنەڕەتیو سەرەتاییەکانی ژیانی خۆیان بکا.

**شەشەم:** دادپەروەریو سەقامگیری کۆمەڵایەتیو ئاشتیو زەمینەی حیوارو راوێژو بیری مانڕەویو هاوسەنگی بڕیارو کارا بوونی دادگاو ئارامی لەناو وڵات بڵاو دەبێتەوە.

**حەوتەم:** زۆر بە ئاسانی مرۆڤ دەتوانێ دینداری خۆی بکاو بە شێوەیەکی ئاسایی دروشمە ئاینیەکانی جێبەجێ بکات، وە بە ئاسانی بەژداری نوێژی بە کۆمەڵو وتاری رۆژانی هەینیو تێکڕای مەراسیمە ئاینیو نەتەوەییو کۆمەڵایەتیەکان بکات.

***

# باسی یەکەم
# ئەمنیەت و ئەرکە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان

مەسەلەی ئەمن و ئاسایش یەکێکە لە سوودبەخشترین بەهرەکانی خوای گەورە بۆ سەر مرۆڤایەتی، چونکە چەترێکە بۆ هەموان و بەهۆیەوە دەتواندرێ خێرو خۆشی خەڵك و خاك بە ئاسانی دەستەبەر ببیٚ و بەختەوەری و هەست کردن بە ئۆقرەیی لەناو کۆمەڵگە پەرە بستێنێت، چەترێکە هەموان بە پیرو لاو و ئافرەت و منداڵ و نەخۆش و هەژارو دەوڵەمەندو پیشەوان و کاربەدەست و کاسب..هتد، سوودی لیٚ وەردەگرن، چەترێکە بەهۆیەوە دەتواندریٚ بە ئاسانی دروشمە خواپەرستیەکان جێبەجیٚ بکرێن و رۆحی دینداری پەرە بستێنیٚ.

لەگەڵ هەبوونی ئارامی و ئاسایش، خەڵك زۆر بە سادەو سانا دەتوانیٚ خواپەرستی بکاو روو بکاتە مزگەوتەکان بۆ ئەنجامدانی نوێژی بە کۆمەڵ و جەژنەکان و تەراویح و بۆنەو یادەکان، دەتوانیٚ کاری مامەڵەو بازرگانی بکاو پارەی دەست کەویٚ و سەرەنجام زەکاتی لیٚ دەر بکات، دەتوانیٚ کاری بانگەوازی و شیکردنەوەی ئیسلام و بنەما دینیەکان بەخەڵك رابگەیەنیٚ، دەتوانیٚ خێرو سەدەقە ئەنجام بداو بەژداری کاری هەرەوەزی و سەردان و بەجێگەیاندنی سیلەی رەحم و سەردان و بەسەرکردنەوەی نەخۆش و لێقەوماوان بکا، دەتوانیٚ بەدوای زانست و زانیاری و تەواو کردنی خوێندن و بەدەست هێنانی بڕوانامەو پلەی زانستی بگەڕیٚ، دەتوانیٚ بەژداری بۆنەو یادە کۆمەڵایەتی و پرسەو ئاشتی و ئاهەنگە شەرعیەکان بکا، دەتوانیٚ رایەڵەی خزمایەتی و پرۆسەی هاوسەرگیری و زیاد کردنی وەچەو نەژادو پتەوکردنی پەیوەندیەکان پەرە پیٚ بدا، دەتوانیٚ رێزو قەدر بۆ خۆی دروست بکاو لەهەمان کات رێز لە خەڵکانی دراوسیٚ و دەوروبەری بگرێت، دەتوانیٚ بە بەردەوامی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بکا، دەتوانیٚ چالاکی رۆژانەو کارو

پیشەی خۆی بەجوانی تەدا بکا، دەتوانێ لەسەر ستەملێکراو بەجواب بیێ و وەك لایەنێکی هاوکار مافی بۆ بگێڕێتەوە.

دەتوانێ سالآنە لەگەڵ هاتنەوەی مەوسمی حەج، بەژداری پرۆسەی بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج بکا، چونکە ئەگەر ئەمنیەت نەبوو هیچ یەك لەوانەو بەتایبەت ناتواندرێ ئەو فەرزە جێبەجێ بکات، لەبەر ئەوەش بە پێی سەرچاوە فیقهیەکانو ئەوەی زانایانی فیقهناسی باسیان لێوە کردووە، یەکێ لە مەرجەکانی واجب بوونو توانینی ئەنجامدانی فەریزەی حەج بریتیە لە هەبوونی ئەمن و ئەمانی رێگای چوونو هاتنەوە (أمن الطريق)، درێژەی ئەو باسە وردترو زیاتر هاتووە، بەوەی دەبێ رێگەی حەج ئەمین بێ بۆ سەلامەتی ماڵو گیانو ئابروو، بەلآم ئەگەر ترسی بۆ دروست بوو لەوەی گیانی سەلامەت نەبێ، یان ماڵی بفەوتێ، یان ناموسی بشکێندرێ، جا ئەو ترسە بەهۆی درندەیەك یا دوژمنێك یان رێگرێکەوە بێ جیاوازی نیە، بگرە ئەگەر هیچ رێگەیەکی تری نەدۆزیەوە جگە لەو رێگە بە ترسە، ئەوە بە پێی فەتواو فیقهی شەریعەت حەجی لەسەر واجب نیە.

ئەگەریش مرۆڤ دوو رێگەی لەبەردەم بێت، واتە رێگەی وشکانی بەلآم گومانی ترسی لێ هەبوو، وە رێگەی دەریاو چوون بە کەشتی، بەلآم ئەمیان سەلامەت تر بوو، ئەوە واجبە لەسەری بە رێی دەریا سەفەری حەج بکا با کولفەکەشی پتر بێت.

یان ئەگەر بە رێگا بەترسەکە رۆیشت ئەوە لەسەریەتی کرێی پاسەوانی رێگە بدا، وە کرێی ئەو کەسەش بدا، کە لە رێی ئەمین شارەزای دەکات[1].

بەو پێیە دەرکەوت یەکێ لە فەریزەکانی ئیسلام بەرستراوەتەوە بە مەرجی ئەمن و ئارامی رێگا بۆ ئەوەی بتواندرێ ئەنجام بدرێت، ئەوەش ئاماژەیەکی گرنگە لە بایەخی ئیسلام بەمەسەلەی ئەمن و ئەمان و رەچاوکردنی دۆخی ئارامی لەهەموو کاتو ئەرکێکدا.

---

[1] _ رووناکی (رب العالمين) رووونکردنەوەی (منهاج الطالبين) بەرگی دووەم: ل ۳۰۸

کەواتــە هــەبوونی ئــەو ئەمنیەتــە وا دەکــا مــرۆڤ بتــوانیٚ بــە جــوانیو دوور لــە تــرس خواپەرستیەکانیو ئەرکی دیندارانەی خۆی بەرێکی ئەنجام بدات، بەڵام ئەگــەر لەهــەر شــوێنو کاتێکدا ئەمنو ئاسایش بەرقەرار نەبوو، ئــەوە ئەســتەمە بتوانــدریٚ وەك پێویســت کارەکــانو ئەرکە دینیەکان بە رێکی ئەنجام بدرێن، بۆیە دەبیٚ هەمیشەو بەردەوام نیعمەتی ئەمنو ئەمان لەبەر چاو بگرینو پارێزگاری لیٚ بکەینو سوپاسی خوای پەروەردگار بکەین، کە ئەو نارامیەی پیٚ بەخشین، چونکە ئەگەر وا نەکەینو ئەو نیعمەتە لەبــەر چــاو نــەگرین، ســەرەنجام بــەخراپ بەسەرمان دەشکێتەوەو رەنگە خوای گەورە لێمان وەربگرێتەوە، هەروەك لەو ئایەتــە ئامــاژەی بەوە کردووەو دەفەرمویٚ: (وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَـدًا مِـنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ)[1]، واتە: خوا نمونەی هێناوەتەوە (بە دانیشتوانی) شارێك کە ژیانیان بە هێمنیو ئاسوودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە رزقو رۆزی جۆراو جۆریــان بــۆ دەهــات (بــەڵام لــە جیــاتی سوپاســگوزاریی) ناشوکرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەکانی خوا بوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاکی برسێتیو ترسی کردە کاڵای باڵایانو تاڵاوی نەداریو ترسی پیٚ چەشتن لــە ســەر ئــەنجامی ئــەو ئــیشو کــارە (ناپوخت و ناڕێکانەدا) کە دەیانکردە پیشەی خۆیان.

بە کورتیەکەی لە چوارچێوەی ئایینی پاكو پیرۆزی ئیسلام، هیچ خواپەرستیەك بــیٚ بــوونی ئــەمنو ئــارامی وەك پێویســت ئــەنجام نــادریٚ، هــەروەك پــەیامی کــۆی پەرستشــەکانیش بەشێوەیەکی راستەوخۆ بیٚ یان ناڕاســتەوخۆ، بایەخدانــە بــە مەســەلەی ئــەمنو رەخســاندنی زەمینەی ئارامی لەهەموو شوێنو زەمەنێکدا.

***

[1] ـ النحل: ١١٢

# باسی دووەم
# روکنەکانی ئیسلام پەیامێك بۆ ئەمن و ئارامی

ئیسلام بۆ رزگاری مرۆڤایەتی‌و بەختەوەرکردنی لەدونیاو دوا رۆژ هاتووە، وە پاراستنی مەسڵەحەت‌و بەرژەوەندی خەڵکی لەبەرچاو گرتووە، بۆیەش تەکلیف‌و فەرمانەکانی لەچوارچێوەی چاکسازی مرۆیی‌و ژیاری دارشتووەو خواپەرستیەکانیشی بە شێوەیەك دەوێ، کە کاریگەری‌و دەرهاوێشتە ئەرێنیەکانیان بەسەر ئەرزی واقعەوە دیار بێت، ئەگەر سەیری شەریعەت بکەین، ئەو راستیە دەسەلێت، کە پیادەکرنی بنەماکانی ئیسلام باشترین رێکارو سیستەمە بۆ پاراستنی سەرو ماڵی هاولاتیان‌و ئارامی‌و هێمنی لەناو کۆمەڵگەدا.

ئەگەر بە وردی لە پێنج فەرزەکانی ئیسلام، کە (شایەتمان‌و نوێژو رۆژو و زەکات‌و حەج)ن، ئەو راستیەمان بۆ دەردەکەوێ، کە تێکرای خواپەرستی‌و فەرمانەکان، وێرای ئەوەی بۆ ئارامی دەروونی‌و جەستەیی‌و دونیایی‌و دوارۆژی سوودی خۆیان هەیە، لەهەمان کات پەیامێکی گرنگ بۆ سەقامگیری‌و ئاشتەوایی‌و ئەمن‌و ئاسایشی نەتەوەیی لەخۆ دەگرن.

وتن‌و دەربڕینی وشەی شایەتمان، کە بە دەروازەی هاتنە ناو جیهانی ئیسلام‌و ئیقرارکردنی ئیمان دادەندرێت، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو مرۆڤە ئیمانی هێناو هاتە ریزی ئەمان‌و پابەندی بە فەرمانەکانی پەروەردگارەوە، بەوەش هەم ئەمنی بۆ خۆی مسۆگەر کرد، هەم دەبێ پەیامی ئارامی بەرووی مرۆڤایەتی بکاتەوە، چونکە باسمان کرد کە ئیمان‌و باوەڕ زامنی ئارامی‌و ئاسایشی کۆمەڵگەیە.

ئەنجام دانی نوێژ کە خواپەرستیەکی بەدەنیەو ئامانج لێی بەجێهێنانی فەرمانی خواو رێك کردنی پەیوەندیەکانی بەندەیە لەگەڵ خوای خۆیی، وە یەکێ لە دەرهاوێشتەو پەیامەکانی نوێژ کردن ئەوەیە، کە مرۆڤ بەهۆیەوە بتوانێ لە کاری تێکدەرانەو خراپ‌و تێکرای ئەو هەنگاوانە

بەدوور بێ، کە زیانی تاك و کۆمەڵگەی تێدایـە[1]، هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێ: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ)[2]، نوێژ بەچاکی ئەنجام بـدە، چـونکە بەڕاسـتی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناهو تاوان و نادروستی دەکات. ئیدی ئەوە پـەیامی نوێـژە، هـەر کـات نوێژخوێن بەتەواوی زانی کە نوێژ بۆ ڕێکخستنی سلوکی تاك و پابەنـدی شـەریعەت و پـەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێـت)، ئەوە هەر خودی ئەو پەیامەش تەئکیـد لـەوە دەکاتەوە، پێویستە موسڵمانان و شوێنکەوتووانی ئەو مەنهەج و شـەریعەتە، وەك ئـەرکێك لـە مەسـەلەی ئـەمن بـڕوانن و دوعـای بەرقـەرابوونی ئـەمن و ئاسـایش بکـەن، وە لـەپێناو دەستەبەربوونیشـی، ڕێکـاری پێویسـت بگرنـە بـەرو خۆپـارێزن لـە هـەموو ئـەو دیـاردەو هەنگاوانەی مەترسی بۆ سەر لایەنی ئەمنی ئەتەوەیی دروست دەکەن.

هەر کات ئەو هۆشیاریە بەتەواوی لەناو هەستی دیندارانەی موسڵمان پـەرەی سـەند، ئـەو ڕاستیەی لا دروست دەبێ، کە ئەنجامدانی نوێژ بۆ خۆ دوور گرتنە لە گوناهو تاوان، بـەوەش وا دەکات هیچ کارێك نەکا ببێتە هۆی تێکچوونی باری ئەمنی و شڵەژانی ئـارامی کۆمەڵایـەتی، چونکە ئەمە پێچەوانەی پەیامی نوێژەو بەتاوان هەژمار دەکرێ.

لە مەسەلەی زەکاتدا، کە واجب کراوە لە سەر موسـڵمانان بـەو مەرجانـەی لـە سەرچـاوە فیقهیەکانەوە هاتووە، یەکێکە لەو پەیامە گرنگانەی ئارامی کۆمەڵایـەتی رادەگـرێ و دەبێتـە هۆی دروست کردنی هاوسەنگی لەنێوان خەڵکی دەوڵەمەندو هەژار، بۆ ئـەوەی ئـەدارەکان لـە سامان و دارایی دەوڵەمەندان سوودمەند بن و ژیان و گوزەرانیان بەلای باشتر بڕوات، ئەگەر ئـەو بنەما ئاینیە پەیڕەو کرا، ئەوە لە لایەکەوە دزی و چەتەیی و ڕێگری نامێنێ، لەلایەکی تـریش خۆشەویستی و ڕێز لەنێوان چینەکانی کۆمەڵگە پـەرە دەسـتێنێ و، مـاڵ و سـامانی خـەڵکیش

---

[1] – حکم احکام القرآن: ل/ ٣٦

[2] ـ العنکبوت: ٤٥

پارێزراو دەبێ، لەلایەکی تریشەوە گیانی هاوکاریو برایەتیو سۆزو بەزەیی لەناو کۆمەڵگە سەرهەڵدەدات، کە هەموو ئەمانە دەبنە هۆکارو پاڵنەر لە دروستبوونی ئارامی کۆمەڵایەتیو ئاسایشی نیشتمانی.

هەروەها بە پێی رێنمایەکانی ئیسلام رۆژوو پەیامێکی گرنگە لە دروستکردنی رایەڵەی ئاشتەواییو سەقامگیری کۆمەڵایەتیەوە.

بە پێی چوارچێوە یاساییو مرۆییەکانەوە، هەر کۆمەڵگەیەك دوور بێ لە رقو کینەو شەڕو ئیرەییو ناخۆشیو ستەمو پێشێل کردنی مافەکان، ئەوە کۆمەڵگەیەکی ئارامو تەندروستەو تێیدا تاکەکانی هەست بە تەباییو ئاشتی دەکەن.

یەکێ لەو فەرمودانەی ئەو پەیامە گرنگو پڕ لە ئاشتەواییە دەردەخا ئەوەیە، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (**وَإِنْ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أو شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ إني صَائِمٌ**)، واتە: ئەگەر کەسێك جنێوی پێدا یان شەڕی لەگەڵ بکا با بڵێ: من وڵامت نادەمەوەو بەرۆژووم.

ئەو فەرمودە بنەمایەکی گرنگە بۆ کەسی رۆژووەوان، کە هەوڵ بدات بۆ دروستکردنی کەشو هەوای ئاشتیو تەباییو ریشەکێش کردنی شەڕەنگێزی، ئەویش لە رێی جنێو نەدانو گوتنی وشەی (**إني صَائِمٌ**)، ئەوە وانەیەکی پەروەردەییە، کە ئیسلام دەیەوێ ئەو کەسە هۆکاری وڵام نەدانەوە بە بەرامبەر بدات، کە بەرۆژوو بوونە، نە ترسو شتی تر.

کەواتە لەهەر وڵاتێك کە فەرزی مانگی رەمەزانی تێدا جێبەجێ بکرێت، دەبێ ئەو هۆشیاریە دروست ببێ، کە یەکێ لە پەیامە گرنگەکانی بەرۆژوو بوونو مانگی رەمەزان ئەوەیە مرۆڤ کاری شەڕو فیتنەو جێنوو شێوازی خراپ ئەنجام نەداو، خۆی لە سەر پەیامی ئاشتەواییو برایەتی رابێنێ، کە ئەمە هۆکارو پاڵنەرێکی گرنگی دەستەبەرکردنی ئەمنی کۆمەڵایەتیو ئاسایشی نەتەوەییە.

حەجکردن وەك ئەرکێکی ئاینی، کە ئاشنا بوونی پەیرەوانی ڕێبازی ئیسلامە بە جیاوازی دەنگ و ڕەنگ و کلتورو وڵاتەوە، بە شوێنێکی وا، کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی لێوە کردووەو پێغەمبەر ئیبراهیمیش دوعای ئەمن و ئەمانی بۆ کردووە، وە لە قورئاندا شاری مەککە بە (بلد الأمین) واتە شاری ئەمن و ئارامی ناوی هاتووە، کە لەسەرجەم وڵاتان خەڵك دێن و لەوێ بە یەك دەگەن بۆ بەجێگەیاندنی فەرزێکی گەورەی ئیسلام، ئەو کۆبوونەوە بەو جیاوازیە زۆرەوە، وێناکردنی سیمای ئۆمەتێکە، کە تەعبیر لە یەك دروشمی ئیسلام و موسڵمانێتی دەکات، ئەوەش بۆ ئەوەیە پەیامێك بداتە مرۆڤ بەوەی هەموویان بە جیاوازی دەنگ و ڕەنگ و شوێنەوە، تەواو کەری یەکترن و پێویستە بنەمای یەکتر ناسی و گیانی هاوکاری و ڕێزگرتن و سۆزو بەزەیی هاتنەوەو پێکەوە ژیان و ئازادی و یەکسانی و ئاشتی و برایەتی لە نێوانیان ڕەچاو بکەن، ئیدی بوونی ئەو هێلە گشتیانە لەسەر ئەرزی واقع، زەمینەی فەراهەم بوونی ئەمن و ئاسایشی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی دروست دەکەن و کاریگەری ئەرێنی ئەنێتەوە.

کەواتە دەرکەوت پەیامی دانەبڕاوی نێو ئامانجەکانی ئەنجامدانی روکن و فەرزەکانی ئیسلام، بۆ ئەوەیە مرۆڤ بە شێوەیەك پەروەردە بکات، کە هۆشیاری تەواویان لەبارەی گرنگی و پێویستی ئەمن و ئاسایشی خۆیان و کیان و نەتەوەیان هەبێ، لەگەڵ ئەوەش دەخوازێ ڕەنج و هەوڵدان بۆ دەستەبەر کردنی ئەمنیەتی نەتەوەیی بە بەشێك لە مەنزومەی دینداری خۆیان سەیر بکەن.

***

# باسی سێیەم
# پەیمان و دەستووری مەدینەو زەمانەتی ئەمن و ئاسایش

بە مەبەستی دانانی دەستوورێکی گونجاو بۆ دۆخی دانیشتوانی مەدینەو، دۆزینەوەی چوارچێوەیەکی هاوبەشی پێکەوە ژیانو بەرقەرار کردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتیو رێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان موسڵمانو هۆزەکانی تری غەیرە موسڵمان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) یەکێ لە کارو هەنگاوە گەورەکانی لە شاری مەدینە دیارکردنو مۆرکردنی پەیمانو دەستووری مەدینە بوو.

دانانی ئەو دەستوورە مەدەنیە لە مەدینە بۆ ئەوە بوو، کە تێکڕای خەڵکی شارەکە هەست بە ئەمان بکەنو هیچ سەرپێچیو کارو هەنگاوێکی وا روو نەدات ببێتە مایەی تێکچوونی باری ئەمنیو دۆخی کۆمەڵایەتی.

ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) دەرکی بەو هەقیقەتە کرد بوو، ئەگەر پەیمانێکی وا لەناو پێکهاتەی شارێکی وەك مەدینە نەبێ، ئیدی مومکین بوو پشێوی بکەوێتەوەو سەرەنجام رەوشەکە بە ئاقارێکی خراپ بڕوات.

لە ژێر رۆشنایی بیروباوەڕی ئیسلامو هێنانەدی ئامانجی شەریعەت، کە پاراستنی دینو ژینو ژیریو نەژادو سەرو سامانی مرۆڤەکانە، وە بۆ بەرجەستە کردنی ئەو رۆڵە پڕ لە شارستانیەتەی ئیسلام وێنای کردووەو، بە مەبەستی کۆکردنەوەی وزەی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤ، دیار کردنی هەموو ئەو سنوورانەی لە بەرژەوەندی کیانو کۆمەڵگە دان، رەزامەندیو کۆدەنگی لەسەر وەرگیراو کاریشی پێ کرا[1].

---

[1] - حقوق الانسان فی الاسلام: ل/ ٤٠١

ئەگەر هەندێ برگەو ماددەی نێو ئەو دەستوورە سەیر بکەین دەبینین، کە پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) هەر لەسەرەتای ئیسلامو گەیاندنی پەیامی ئاسمانو کاری بانگەوازی، رەچاوی ئەو بنەما گرنگانەی کردووە، کە زەمانەتی ئاشتیو ئارامی کۆمەڵگە دەکەن، بۆ نمونە چەند برگەیەك لە دەقی ئەو دەستوورە دەخەینە روو:

**یەکەم:** هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە بە ئارامیو لە دۆخێکی بە ئەمنیەتەوە ژیان بەسەر بباو لە خۆیو دینو ماڵو حاڵی خۆی ئەمین بێو کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر.

**دووەم:** ئاشتی موسڵمانان یەك ئاشتیە، وە ئەگەر یەکێك ویستی ستەمو دەست درێژیو خراپە بکات لە ناو موسڵمانان، پێویستە هەموویان پێکەوە لێی راست ببنەوەو رێگری لێ بکەن.

**سێیەم:** جولەکە لەسەر ئایینی خۆیانن، موسڵمانانیش لەسەر ئایینی خۆیانن.

**چوارەم:** نابێ کەس ستەم لە هاوپەیمانی بکات، ستەم لێکراویش پێویستە سەر بخرێ، هاوسێش وەك مرۆڤە نابێ زیانو تاوانی هەبێت.

**پێنجەم:** هەر کەسێ لە جولەکەو موسڵمان لە مەدینە دەرچوو، یا مایەوە با لە خۆی دڵنیا بێتو دەست درێژی ناکرێتە سەر، مەگەر کارێکی نارەوا یان ستەم بکات.

**شەشەم:** هەر کەسێ هێرشی هێنا بۆ سەر مەدینە، دەبێ موسڵمانو جولەکە بە یەکەوە بەرەنگاری ببنەوەو شارەکە بپارێزن.

**حەوتەم:** موسڵمانان چ قورەیشو چ مەدینەییو چ ئەوانەی لەمەودوا بەگەریان دەکەون بە یەك گەڵ هەژمار دەکرێن.

ئەگەر سەیری ئەو خاڵانە بکەین، ئەو راستیە دەردەکەوێت، کە ئیسلامو پەیامی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هاوشان لەگەڵ پەیمانی مەدینە رۆڵیان هەبووە لەمەڕ پرسێکی وا گرنگو پەیوەست بە ژیانی کۆمەڵگەو، هێنانەدی ئاشتەواییو بەقەرار کردنی ئاسایشو

ئارامی ناوچەکە، چونکە هەر بە پێی ئەو دەستووره باس لەوە کراوە، کە ئەمنیەت و عەقیدە دوو شتی پێکەوە گرێدراون و پێویستە موسڵمانان بیان پارێزن.

ئیدی ئەو دەستووره توانی ببێتە خاڵی دەسپێك و وەرچەرخانێکی گەورەو بنەڕەتی لە ژیانی کۆمەڵاتی ئەو کات و، تەنانەت ئەو دەستوورەش بووە بە بنەمایەکی گەشاوەو کاریگەر لەسەر ئاستی وڵاتان بە قۆناغی ئێستاشەوە، لەبەر ئەوە توانی ببێتە زامنی:

**یەکەم:** پاراستنی شوناسی ئایینی موسڵمانان و دانانی هێڵی سوور بۆ هەموو ئەوانەی هەوڵی شێواندنی دەدەن.

**دووەم:** دابین کردنی ئازادی پێویست و گونجاو، بەوەی هەر کەس لە موسڵمان و جولەکە خاوەنی دینی خۆیەتی[1].

**سێیەم:** فەراهەم بوونی دادپەروەری و یەکسانی و ممارەسەکردنی مافە کەسی و کۆمەڵایەتیەکان.

لەبەر ئەوە دەکرێ بڵێین دەستووری مەدینە یان پەیمانی مەدینە، بە خاڵێکی بەهێز دادەندرێت لە هێنانەدی ئاشتی و هێمنی و ئاسایشی نەتەوەیی، بەو مەرجەی کاری پێ بکرێ و لە سەر ئەرزی واقع بە پراکتیکی ڕەنگ بداتەوە، لەوەشدا ئەرکە هەمووان بەتایبەت موسڵمانی هۆشیار و شارەزا، ئەو پەیمانە بە کارتێکی سەرەکی دابنێ، بۆ پاڵپشتی و هەوڵدان و پاراستنی ئەمنیەتی کۆمەڵگە و ئارامی وڵات و ئاسایشی نیشتمانەوە.

***

[1] ـ السيرة النبوية: ل/ ٣٣٢

# باسی چوارەم
# ئایینی ئیسلام و مافی پەنابەریتی و ئاسایشی بێ باوەڕان

یەکێ لە سیماو تایبەتمەندیەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەیە، کە ئاینێکی گشتگیرەو بۆ تێکرای مرۆڤایەتی هاتووە، لەوەشدا ئیسلام وەك چۆن دەیەوێ شوێنکەوتووانی بخاتە ژێر رکێفی رەحمەتی خۆیەوەو ئەمنیەتیان پارێزراو بێ، بەهەمان شێوە دەیەوێ ئەوانەی موسڵمانیش نین و بێ باوەڕن لە ئەمان دابن و ئەمنیەتیان پارێزراو بێت، کە ئەمەش خاڵێکی گرنگە لە فراوانێتی و لێبوردەیی و میهرەبانی ئیسلام و، پەیامە ئاشتەوایی و پڕ لە ئەمانەکەی بۆ جیهان و مرۆڤایەتی.

خوای گەورە رێزی لە مرۆڤ ناوەو مافی گوزەران و ژیانی بە بێ جیاوازی دەنگ و رەنگ و شوێن و زەمەنەوە، بە تێکرای ئادەمیزادەکان بەخشیوە، واتە ئەوانەی غەیرە موسڵمانن دەبێ بەهەمان شێوەی موسڵمانان ماف و ژیان و رێزو سەرو ماڵ و کەرامەتیان پارێزراو بێ[1].

لەبەر ئەوە هەر لە سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە، سیستەمی (پەرنابەریتی) و ئەمان دانراو کاری پێ کرا، بۆ ئەوەی مامەڵەی موسڵمانان لەگەڵ غیرە موسڵمانانیش لە ئاستێکی ئینسانی و کەشێکی ئارام و سەقامگیر بێت.

ئەو سیستەمەش رێك لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە، کاتێ خوای گەورە دەفەرموێ: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ)[2]، واتە: ئەگەر کەسێك لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەی ئیماندار، ئەوە تۆیش پەنای بدە، هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا

---

[1] - قضية الأمن في الواقع الاسلامي: ل/ ١١٥
[2] - التوبة: ٦

(قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و(ماڵ و گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چیە).

زانای ناوداری بواری قورئانناسی (ئیبنو کەسیر) لە تەفسیری ئەو ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەگەر کەسێك لە (دار الحرب) وە هاتە ناو (دار الاسلام) بەمەبەستی ئامانجێکی دیاریکراو وەك (خوێندن، بازرگانی، چارەسەری.. هتد)، وە داوای پەنابەرێتیو ئەمانی کرد، ئەوە پێویستە پێشەوای موسڵمانان پەنای بدا تا دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی[1].

سیستەمی ئەمانو پەنابەرێتی لە ئیسلامدا، بۆ چاودرێریو پاراستنو ئەمنیەتی ئەوانەیە، کە بەهۆی پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکانەوە لە غەیرە موسڵمانان دێنە ناو وڵاتی موسڵمانانەوە[2]، بەو مەرجەی هاتنیان نەبێتە مایەی شێواندنو تێکدانی باری ئەمنی وڵاتو بەرژەوەندی گشتی خەڵکەوە.

کەواتە ئەوە پێویستی بە هەوڵ وهۆشیاری هەموو تاکێکە، بۆ ئەوەی وەك ئەرك هەست بەوە بکا، کە بە پێی بنەماکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەلامەتیو ئەمنیەتی غەیرە موسڵمانانیش پێویستەو، دەبێ لە ماڵو گیانو سامانو ژیانو گوزەرانیان ئەمینو ئارام بن.

***

[1]- مختصر تفسير ابن كثير: ب/٢ ل/١٣٠

[2]- في السياسة الشرعية: ل/ ٣٥٩

## دەسپێك..

بە پێی ئەو زانیاریانەی پێشەوەو وردبوونەوە لە ماناو مەبەستو گرنگی بوونی ئارامی کۆمەڵگەو ئاسایشی نەتەوەیی دەگەینە ئەو راستیە، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام چەندین هۆی دیاریکردووە بۆ ئەوەی ئەمنو ئاسایش لەناو کۆمەڵگەو وڵاتان بەرقەرار بێتو، دۆخی ژیانو ژینگەی مرۆڤایەتی ئارامو سەقامگیر بێت، ئەوەش لەکرۆکی بەرنامەو دەرهاوێشتەکانی مەنزومەو قیەمی دینداری مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەو هۆیانەی دەبنە مایەی خۆشکردنی زەمینەی وەدیهاتنی ئاسایشی نەتەوەیی جۆراوجۆرنو، بە پێی سەردەمو شوێن دەگۆڕێن، چونکە ئەمنیەت واتە پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەییو هەبوونی قەوارەیەکی ستراتیژی بۆ ئەم مەبەستە، بۆیە زۆرجار مەسەلەکە لەسەر بنەمای چاو خشاندنەوە بە رێکخستنەوەی بەرژەوەندیەکان (**ترتیب المصالح**) دادەمەزرێو، کاریگەری دەکاتە سەر جۆری پاڵنەرەکانی پەیدا بوونی ئەو پرسە، بۆ نمونە ئەمرۆ بەرژەوەندی نەتەوەییو، بەیانی بەرژەوەندی ئابووریو کۆمەڵایەتیو، دووبەیانی بەرژەوەندی سیاسیو چەكو هێز..! واتە هەر وڵاتێك بە پێی بەرژەوەندی نەتەوەی خۆی، مامەڵە لەگەڵ فکرەی ئاسایشی نەتەوەییو نیشتمانی دەکات.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام هۆکارگەلێکی دیاری کردووە، رەنگە بەشێکی ئەو هۆکارانەش لەنێو بەشێکی بابەتەکان باس کرا بێ، بەشێکیشی زۆر هەڵدەگرێو رەنگە نەگونجێ لێرەوە هەموو لقو پۆیەکانی باس بکەین، بەڵام ئەوەی خاڵی بەهێزو گرنگە ئاماژەیان پێ بکەین ئەو هۆیانەی خوارەوەن، کە ئەمنو ئارامیو ئاسایش دروست دەکەن:

# باسی یەکەم
# فەراهەم بوونی ئاشتی

ئیسلام گرنگیەکی یەکجار زۆری داوە بە مەسەلەی ئاشتی، لەچەندین ئایەتی قورئان و دەقی فەرمودەی پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) ئەو راستیە رەنگی داوەتەوە، بەردەوامیش ئیسلام بانگەشەی ئاشتی دەکاو بە پێویستی دەزانیێ و پێشوازی لێ دەکات، هەروەك لەو ئایەتە دەردەکەوێ، کە خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ)[1]، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانو باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی ئیسلام و ئاشتیەوەو، بە تەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە (هەمیشە دەیەوێت شەڕو جەنگ لە نێوان خەڵکیدا بەرپا بکات و لە ئیسلام دووریان بخاتەوە).

ئەمە نەك بەتەنها لەکاتی خۆشی ئیسلام بانگەی ئاشتی دەکا، بەڵکو بە پێی ڕێنمایە قورئانیەکان لەکاتی نا ئاسایی و شەڕدا، ئەگەر موسڵمانان دڵنیا بوونەوە لە دوژمنانیان و زانیان دێنە ژێر باڵی ئاشتەواییەوە، دەبێ ئاشتەوایی قەبوڵ بکەن و پێوەی پابەند بن، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: (وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)[2]، واتە: ئەگەر (دوژمنان) بەلای ئاشتیدا دایانشکاندو حەزیان پێکرد، تۆش _ئەی محمد (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەی پێشەوا_ ئامادەیی خۆت دەربڕەو پشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو زانایە (لە پیلان و نەخشەی دوژمنان ئاگادارە).

---

[1] - البقرة: ٢٠٨
[2] - الأنفال: ٦١

لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی درکاندووە، کە سەلام (ئاشتی) سڵاوی پێکگەیشتن و پێشوازی و هەواڵ پرسینی نێوان خەڵکە لە دونیاو، ناوی بەهەشت و شانازیەکە بۆ بەهەشتیان لە دوا رۆژدا، چونکە بۆ سڵاو کردنی خەڵك لە یەکتری و سەلام دانەوەی نوێژ، وشەی (السلام) واتە ئاشتی دیاری کراوە، وەك پەیامێکیش بۆ هۆشیاری ئۆمەت لەمەڕ ئەو پرسە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی روونکردۆتەوە، کە (سلام) سڵاوی ئۆمەتە و ئەمن و ئاشتەواییە بۆ ئەوانەی غەیرە موسڵمانن و لەناو موسڵمانان ژیان بەسەر دەبەن[1].

لەوەش زیاتر یەکێ لەناوەکانی خوای گەورە (السلام)ە[2]، وە ناوی یەکێ لە شوێنە خۆشەکانی بەهەشت (دار السلام)ە، وە دروشم و سڵاو و گفتوگۆی بەهەشتیان سەلامە، وە پەیامی خوا بۆ پێغەمبەران هەر سەلام بووە، وەك لەو ئایەتانەی خوارەوە ئاماژەی بۆ کراوە:

_ (هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ)[3]، واتە: خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو خوایەکی تر نیە، پاشای هەموو بوونەوەرە، پاك و بێگەردو پوختە، ئاشتی خوازو ئاشتی پەروەرە.

_ (لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِنْدَ رَبِّهِمْ)[4]، واتە: بەهەشتیان بەهەشتی پڕ لە ئاشتی و هێمنیان بۆ ئامادەیە لای پەروەردگاریان.

_ (تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ)[5]، واتە: چاك و چۆنیان لەو بەهەشتەدا سڵاوکردنە.

_ (سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ)[1]، (سَلَامٌ عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ)[2]، (سَلَامٌ عَلَى إِلْ يَاسِينَ)[3]...هتد.

---

[1] – السلام في الإسلام: ل/٥

[2] – أصول الإيمان والإسلام: ل/٦٤

[3] – الحشر: ٢٣

[4] – الأنعام: ١٢٧

[5] – ابراهيم: ٢٣

تەنانەت پیرۆزترین دە شەوەکانی وەرزی ساڵ کە خۆیان لە شەوانی (قەدر)ی مانگی ڕەمەزان دەبیننەوە، شەوانێکە تایبەتمەندی خۆیان هەیەو پەیامی قورئانیان تێدا دابەزیوەو، بگرە لەو شەوانە جبرائیل و مەلائیکەی ئاسمان پۆڵ پۆڵ دادەبەزنە سەر زەوی و، یەکێ لە دروشم و پەیامەکانیان بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی و سەرزەوی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئاشتی (سلام)ە، ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ، سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾[4]، واتە: لەو شەوەدا فریشتەکان کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕووخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فرمان و کار (بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆسەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لە قورئان و...هتد)، ئەو شەوە ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانیە، هەتا کاتی بەرەبەیان.

دکتۆر وەهبەت زوحەیلی لە راڤەی ئەو ئایەتە دەڵێ: خێرو گەورەیی ئەو شەوەو هاتنە خوارەوەی مەلائیکەو دابەزینی قورئان تەنها بۆ بڵاوکردنەوەی سەلام و ئەمن و ئارامی و بەرەکەتە[5].

کەواتە ئایینی ئیسلام هەر لە سەرەتای هاتنیەوە، هەڵگری ئاڵای ئاشتیەو، وەك بنەمایەکی گرنگ و پێویست بۆ نێو کۆڕی ژیان دایدەنێ و بانگەشەی بۆ دەکا، وە یەکێ لە مەهامە گرنگەکانی بیست و سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی ئاشتی بووەو هانی شوێنکەوتوانیشی داوە بۆ ئاشتی، تەنانەت ئەگەر ئەڵێین هەموو ئەوە زۆربەی جەنگەکانی لەپێناو دەستەبەرکردنی ئاشتی بووە، بگرە چەندین ڕێو شوێنی دیاریکردوە بۆ پارێزگاری کردن و بەرجەستە کردنی ئاشتی لەناو کۆمەڵگەدا.

---

[1] - الصافات: ١٠٩
[2] - الصافات: ١٢٠
[3] - الصافات: ١٣٠
[4] - القدر: ٤-٥
[5] - التفسير المنير: ب/١٥ ل/٧٢٦

هەموو ئەو داننانو هەوڵو بایەخانەی ئیسلام بۆ ئاشتی، دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی ئەو پرسە لەمەڕ دروستکردنی زەمینەی ئارامیو پارێزگاری کردن لە بەها مرۆییەکانو پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان بە جیاوازی رەنگو دەنگو زمانەوە، ئەو باسکردنو وروژاندنە پەیوەستە بە کاریگەریو پێگەی ئاشتی لە بەرقەراربوونی ئەمنو ئاسایشی کۆمەڵگەو نەتەوە، لەبەر ئەوەی بنەماکانی ئاشتەوایی هەمیشە دەبنە مایەی خێرو ئارامی بۆ سەر لایەنی دەروونیو کۆمەڵایەتیو مرۆییەوە.

❊❊❊

# باسی دووەم
# سەقامگیری کۆمەڵایەتی

هەر چەندە چەمکی سەقامگیریو ئاسایش لێکەوە نزیکن، بەڵام وەك پرنسیپو ناوەرۆك بەدیویێك تەواوکەرو تیکهەڵکێشی یەکترن، چونکە نە ئەمن بێ سەقامگیریو نە سەقامگیریش بێ بوونی ئەمنیەت فەراهەم نابن، بەدیوێکی تر دەکرێ بڵێین ئەمنو ئاسایش زیاتر پەیوەستە بە لایەنی پەیوەندارو سوڵتەی وڵاتەوە، بەڵام سەقامگیری بەرهەمو لێکەوتەی ئاساییشەو پەیوەندی بە تێکڕای تاکەکانی نێو کۆمەڵگەوە هەیە.

یەکێ ئەو پرسانەی ئیسلام بایەخی پێداوەو هەوڵی بلاوکردنەوەی دەدات سەقامگیری کۆمەڵایەتیە، بۆ ئەوەی خەڵك لە کیانو ژیانی خۆی ئەمین بێ، بۆ ئەو مەبەستە چەندین چوارچێوەی دیاری کردوە، کە سەرجەمیان دەبنە هۆکاری دروستبوونی سەقامگیری کۆمەڵایەتی لەواتە:

## یەکەم: بنەمای دادپەروەری

دادپەروەری بریتیە لە دانانو بەکار هێنانی هەر شتێك لە شوێنی خۆی، وە پێدانو دیارکردنی (هەق)ە، بە هەموو پێگەو شوێنو پیشەو پۆستو دەستەڵاتو بەخشینێکەوە[1].

خوای گەورە لە قورئاندا لە چەندین شوێن باسی لە دادپەروەری کردووەو فەرمانی بە بەندەکانی کردووە، کە پابەند بن بە مەسەلەی دادگەریەوە، لەو بارەوە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا

[1] ـ السنن الإلهية: ل/١١٥

الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ)[1].

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، زۆر بەچاکی هەستن بەئەنجامدانی شایەتی دادپەروەرانە لەبەر خوا، رق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت کە لە دادپەروەریی لابدەن، دادپەروەر بن، ئەوە نزیکترە لە تەقواو خواناسییەوە، دەی کەواتە لەخوا ترس و پارێزکاربن، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو کارو کردەوەیەی کە دەیکەن.

لە شوێنێکی تر دەفەرموێ: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ)، واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری. کە ئەمە فەرمانێکی رەهایە بەدادگەری و شمولی هەموو تاکێك دەکا، لەبەر ئەوە زانایان دەفەرموون: دادگەری شتێکی واجبە لەهەموو شتێکدا، وە لەسەر هەموو تاکێك، بەهەمان شێوە ستەم و نادادی لەهەموو شتێك و بۆ هەموو کەسێك حەرامە[2].

هەر خودی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، کە هات بۆ ئەوە بوو کۆمەڵگەی عەرەبی لەستەم و بێ دادی رزگار بکاو، خەڵك رابێنێ لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی دادپەروەری و یەکسانی لە ماف و ئەرکەکاندا، کە بە کردەیی لەسەر ئەرزی واقع ئەو بانگەشە رەنگی دایەوە[3].

بە پێی ئەو ئاماژانەی سەرەوەو کۆی ئەو بایەخ و دەقە تایبەتانەی پەیوەست بەو پرسەوە دەکرێ بڵێین: دادگەری رۆح و گەوهەری ئیسلامە، سیاسەتی ئیسلامیش بەتێکڕای چەمکەکانیەوە تەرکیزی لەسەر دادگەری کردووەو، هەموو پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەکانی پێوە بەستۆتەوە[4].

---

[1] - المائدة: ٨
[2] - هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل/١١٥
[3] - النظم الإسلامية دراسة تأريخية: ل/٢٢٦
[4] - النظم الإسلامية: ٤٦

لەبەر ئەوەی دادپـەروەری دەبێتـە مایـەی گەیشـتنی تـاك بـە مافـەکانیو بنـەبڕ بـوونی دیاردەکـانی وەك مەحسـوبیەتو بـەرتیلو پێشـێل کردنـی مافـەکانو تێکـدانی ئـازادیو دروستبوونی ستەمو رەقو کینەو لێکترازانو زمـانی زبـرو شـتی تـر، بۆیـە ئیسـلام دەیـەوێ هەمیشە دادگەری لەناو کۆمەڵگەو لە بەرنامەی تاکەکان بـەجیاوازی پلـەو پۆسـتو پیشـەوە بوونی هەبێ، تا ساقامگیری کۆمەڵایەتی بکەوێتە گەشە سەندنو دۆخێکی باشو هێمنەوە.

## دووەم: ئیسلاحو چاکەکاری

کۆی شـەریعەتی ئیسـلام جـەخت لـەوە دەکاتـەوە، کـە مـرۆڤ چـاکەکار بـێو زەمینـەی چاکەکاریو ئیسـلاح خـۆش بکـات، تەنانـەت تێکـڕای فەرمانـە قورئانیـەکان لەچوارچـێوەی ئەنجامدانی کارو هەنگاوی چاکە داڕێژراون، لەبەر ئەو گرنگیەیە چەمکی (**الإصلاح_ الإحسان**) سازانو چاکە بە ڕێژەیەکی زۆرو بەرفراوان لە قورئاندا باسی لێوە کراوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: (**وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ**)[1].

واتە: ئێمە پێغەمبەران بۆ هیچ شتێك نانێرین جگە بۆ مژدەدان نەبێت (بـۆ ئیمانـداران) و ترساندن نەبێت (بۆ بێ باوەڕان)، جا ئەوەی ئیمان و باوەڕ بهێنێتوچاکسازو چاکە بکات، ئەوە نەترس و بیمیان لەسەرە، نە غەمبار دەبن.

لە دەقێکی تردا دەفەرموێ: (**فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ**)[2].

واتە: لە خوا بترسن و چاکسازی نێـوانی خۆتـان بکـەن (مەیـەڵن لەسـەر تـەماعی دنیـا نێوانتان بشێوێت).

---

[1] ـ الأنعام: ٤٨
[2] ـ الأنفال: ١

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرمویَ: (إِنَّ اللَّـهَ كَتَـبَ الْإِحْسَـانَ على كل شَيْءٍ)[1]، واتە خوا فەرمانی چاکەی بۆ هەموو شتێك بڕیار داوە، کە بە چاك مامەڵـە بکەن.

چونکە ئەگەر چاکەکاری بووە پیشەو رەوشـتی تاکـەکانی نێـو کۆمەڵگـە، ئـەوە رێگـەی سوودو قازانج بۆ خۆیان خۆش و ساز دەکەن و سەقامگیری کۆمەڵگـە دەنێنـەوە، بـەڵام ئەگـەر بەجۆرێك لە جۆرەکان ئەو بەهایە کزو کەم و بوو، بەزۆر لەسەر هەمووان دەوەسـتێت، هـەروەك خوای باڵادەست ئاماژەی پێداوەو دەفەرمویَ: (إِنْ أَحْسَنْتُمْ أَحْسَنْتُمْ لِأَنْفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا)[2]، واتە: ئەگەر (لەکاتی دەسەڵاتدا) چاکە بکەن، ئەوە هەر بـۆ خۆتـان چـاك و بەسـوودە، ئەگـەر خراپەو تاوانیش بکەن ئەوە هەر یەخەی خۆتـان دەگرێتـەوە. یـاخود دەفـەرمویَ: (هَـلْ جَـزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ)[3]، واتە: مەگەر پاداشتی چاکە تەنها چاکە نیە؟!

## سێیەم: گیانی هاوکاری

هەبوونی گیانی هاوکاری لەنێوان تاکەکان، یەکێکە لەو بنـەما قورئانیانـەی بەسەرچـاوەی زۆرێك لە هاتنە رێی خێرو چاکە بۆ مرۆڤ دێت، بەڵام دەبێ ئەو هاوکاریـە لەسـەر بنەمایـەکی دروست و خێرو شەرعیەوە بێت، نەك لەسەر شتی نادروست و خراپەوە، هـەروەك خـوای گـەورە دەفەرمویَ: (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُـدْوَانِ وَاتَّقُـوا اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)[4]، واتە: یارمـەتی و کۆمـەکی یـەکتر بکـەن لەسـەر چـاکەو خواناسـی، نەکـەن

[1] - صحيح مسلم: ب/٣ ل/١٥٤٨
[2] - الإسراء: ٧
[3] - الرحمن: ٦٠
[4] - المائدة: ٢

یارمەتی‌و کۆمەکی یەکتر بکەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی، لـە خـوا بترسـن و پارێزکـار بـن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر بە توندی تۆڵە دەسێنێت.

ئەو رۆحی هاریکاریە بە پراکتیکی لەنێو کۆڕی یاوەرانی پێغەمبەر (درودی خـوای لەســەر بێت) رەنگی دابویەوە، بۆیەش هەمیشە لێکەوە نزیك بوون‌و وەك یەك جەستە وا بوون، چونکە دەیانزانی ئەو رۆحیەتە لەگەڵ ئەوەی پابەندی‌و بەجێگەیاندنی فەرمانی خوایە، لەهەمان کـات هێڵی راکێشانی هاوکاری خوایی بۆ نێویان زیاترو ئەسـتوور تـر دەکـات، هـەروەك پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: **(وَاللَّهُ في عَوْنِ الْعَبْدِ ما كـان الْعَبْـدُ في عَـوْنِ أَخِيـهِ)**[1]، واتە: خوای گەورە یارمـەتی بەندەی خۆی دەدات، مادام ئەو بەندە لە یارمــەتی دان‌و هاوکـاری بەندەو براکانی خۆی دایە.

بۆیە ئاینی ئیسلام هانی مرۆڤ دەدات بەردەوام گیانی هاوکاری بنوێنێ، بەتایبـەت لەگـەڵ دەورویەرو خزم‌و دۆستان، چونکە ئەو هاوکـاری کردنـە دەبێتـە مایـەی بڵاوبوونـەوەی گیـانی خۆشەویستی لە نێو تاکـەکان‌و، کۆمەڵگـە دەکاتـە یـەك جەسـتەو، جەمســەرەکانی پێکـەوە دەبەسـتێتەوە، هـەروەها هۆکـارە بـۆ پەیـدا بـوونی هێـزو وزەی زۆرو پەرەسـەندنی بـواری بەرهەمهێنان‌و گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی‌و، رێگە تەسك‌و کارە قوڕسەکان لەبەردەم تاك ئاسان دەکاتەوە.

هەموو ئەو بەها جوانانەش دەبنە هۆکاری زیاتر بەرقەرار بوونی سەقامگیری کۆمەڵایەتی‌و دواتر هەنگاوی ئیجابیان لێ دەکەوێـتەوە، بۆ فەراهەم بوونی ئاسایشی نەتەوەیی.

---

[1] - صحيح مسلم: ب/٤ ل/٢٠٧٤

## چوارەم: وەلانان و کەمکردنەوەی خراپە

ئیسلام هۆشیاریەکی تەواوی لەدووتۆی قورئان و فەرموودە راگەیاندووە، کە پێویستە مرۆڤ هەمیشە لای خێر هەڵبژێریّ و خۆی بەدوور بگرێت لە کارو گوفتارو رەفتارو گومانی خراپ، چونکە هەبوونی ئەو دیاردانە زیانی بۆ سەقامگیری کۆمەڵایەتی هەیە، بۆیە خوای گەورە فەرمانی کردووە توخنی ئەو جۆرە تاوانانە نەکەوین و لەسەر وڵات و جەستەی کۆمەڵگە دووریان خەینەوە، لەدوو ئایەتی قورئاندا خوای کار لەجێ بەنیدای ئیمانەوە هۆشیاری دەداتە ئێمەی مرۆڤ، کە ئەوەش هێمایە بۆ هەستیاری ئەو پرسانەی لەدوای ئەو نیدا ئیمانیەوە دێن هەر وەك دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[1]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش با گاڵتە بەیەك نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن.. سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن (چونکە سووکایەتی بەیەکتر سووکایەتیە بە خۆتان) هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کە چەند ناشرینە ناوو ناتۆرەی خراپ لە دوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەوە لە گوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانە هەر ستەمکارن.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ)

---

[1] - الحجرات: ١١

[1]، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن (بۆیە حەق وایە لەهەمو گومانێك خۆپارێزبین)، بە شوێن کەمو کووڕیی و عەیبو عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملە باسی یەکتری و ناوی یەکتری بەخراپ مەبەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەختو ناخۆشە، دەی کەواتە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، چونکە بەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆیان.

دەکرێ بڵێین لەبەرچاوگرتن و ڕۆڵ پێدانی ئیسلام بۆ هەر چوار خاڵی پێشەوە لەو ئایەتە قورئانیە دەرەکەوێت، کە خوای گەورە وەك پرنسیپ و پاڵنەری دروستبوونی سەقامگیری کۆمەڵایەتی دیاری کردوون و دەفەرموێ: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)[2]، واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس) و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

***

[1] ـ الحجرات: ١٢
[2] ـ النحل: ٩٠

## پێنجەم: بنەمای دیالۆگ و راوێژ

هەر لەپێناو ئەو مەبەستە ئایینی ئیسلام بانگەشەی دیالۆگ و ئازادی بیروڕاو راوێژ دەکات، چونکە گفتوگۆی بنیاتنەرو نەخشەنامێز هەنگاوێکی ئیجابی و ویستراوە بۆ گەڕان و دۆزینەوەی راستی و چارەسەرییەکان، کرانەوەی ئیسلام لەو بوارەدا بۆ بەخشینی قەناعەتێکی دروست و فەلسەفەییێکی لۆژیکیانەیە، تا بەهۆیەوە تاک و کۆمەڵ و کیان و نیشتمان سازانی درێژخایەن دامەزرێنن.

هەبوونی راوێژ چ لەسەر ئاستی خێزانی بێ یان کۆمەڵایەتی، یان قەوارەو کیانی سیاسی، یان دەوڵەت و حوکمڕانی، کە ئەمانە بە وێستگەی راوێژ هەژمار دەکرێن[1]، هەنگاوێکی بنیاتنەرە لە باشترکردن و بەرەو پێشەوە بردنی پرۆسەی سەقامگیری، چونکە شورا هەمیشە جۆرێك لە بەرچاو روونی و پابەندی دروست دەکا، نەك لادان و تاکڕەوی و بڕیاری کورت بینانە.

لەگەڵ ئەوەش بە پێی زۆرێك لە ئاماژەکان مەسەلەی شورا بە بنەمایەکی گرنگی سیستەمی ئیسلامی دادەنرێت و هیچ بەرنامەو نەخشەرێیەك بێ بوونی راوێژ لەدیدی ئیسلامدا سەرناگرێ[2].

بۆیە خوای گەورە ئەو چەمکەی وەك بنەمایەکی گرنگ لە قورئاندا باس کردووە، تا هۆشیاری بداتە مرۆڤ و کیان و کۆمەڵگەکان، کە ئیدی زەرورەتی راوێژ و دیالۆگی مرۆیی و نیشتمانی نەك تەنها شتێکی باسکراوە، بەڵکو مەسەلەیەکی حەتمی و پێویستی گشت رۆژگارێکە.

خوای گەورە لەبارەی دیالۆك و سازاندنی زەمینەی حیوار دەفەرموێ: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ

[1]- نظام الشورى: ل/١٧٩

[2]- النظم السياسية: ل/٣٥٤

**وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**)[1]، واتە: ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەی ئیماندار، بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو رێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی (بۆ هەندێك)و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، (بۆ هەندێکی تر)و گفتوگۆ و دیالۆك و موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بەهیدایەت وەرگران.

لەبارەی راوێژیشەوە، کە سورەتێکی قورئانی بەو ناوەوە ناوەوە دەفەرموێ: (**وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ**)[2]، واتە: فەرمانو کاروباری موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا بە شوراو راوێژ کردنە.

فەرمانیش دەکا پابەندی بنوێنین بە بنەمای راوێژەوەو دەفەرموێ: (**وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ**)[3]، واتە: لە کارو پێشهاتدا پرسو راوێژ بە یاوەرانت بکە. کە مەبەست ئەوانەنن دەبنە جێی راوێژ پێ کردنو مشورەتیان بەلاوە گرنگەو شارەزان لەو بوارە.

تەنانەت یەکێ لە خەسڵەتە هەرە دیارەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەوە بووە، کە لە کاروبارو پرسە گرنگو هەستیارو پەیوەستەکانی دینو دونیا، راوێژی لەگەڵ یاوەران کردووەو بەهەندیشی وەرگرتووە، هەر بە نمونە لە غەزای ئوحد راوێژی لەگەڵ یاوەرانی کرد، چونکە پرسەکە پێویستی بە لێکدانەوەو لێ وردبونەوە هەبوو، وە کاریشی بەو بڕیارە کرد کە وەك دەرەنجامی راوێژەکە دەسکەوت[4].

بە کورتیەکی مەسەلەی سەقامگیری کۆمەڵایەتی چەندین لقو پۆی تایبەتو گشتیو گرنگی هەیە، کە پێکەوە زەمانەتی دروستبوونو مانەوەی لەناو کۆمەڵگە دەکەنو، سەرنجام ئەو سەقامگیری کۆمەڵایەتیە دەبێتە کارتێکی بەهێز بۆ دەستەبەر بوونی ئەمنو ئاسایشی نەتەوەییو نیشتمانی.

---

[1] ـ النحل: ١٢٥
[2] ـ الشورى: ٣٨
[3] ـ آل عمران: ١٥٩
[4] ـ فقه السيرة: ل/١٨٩

# باسی سێیەم
# هۆشیاریو پەروەردەی تەندروستو پێویست

ئیسلام وەك ئاینو شەریعەت وەك دەستوورو مەنهەج، هەمیشە ویستویەتی شوێنکەوتووانی لەسەر پەروەردەو هۆشیاریەکی پێویستو تەواوەوە رابێنێت، لەبەر ئەوەی پەروەردە بنەمایەکی بنەڕەتیو گرنگە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤو کراوەی فکریو کۆمەڵایەتیو گەیشتن بە پلەکانی خێرو دروستبوونی کەسایەتیەکی تەندروستو دەروون پاك[1].

ئیسلام بەر لە تەکلیفی بنەما شەرعیەکان کار لە پێناو دارشتنو بیناکردنی هەستو نەستی مرۆڤ دەکا لەسەر بنەمایەکی ئینسانی، بۆ ئەوەی ئەو کەسە ببێتە خاوەن هەستێکی زیندو و لەکاتی پێویستو هەڵوێستدا بێتە سەرخەت، بەڵام ئاراستەی ئەو حاڵەتەی بەستۆتەوە بە هەردوو بنەمای ترس لەخواو خۆشەویستی لەپێناو خوا، واتە هەر کارێکی نارەوا کە واز لێ دێنێ لە ترسی خوا بێ‌و، هەر کارێکی باشیش بکات لەپێناو رەزامەندیو خۆشەویستی خوا بێت.

هەر کات تاك ئەو پەروەدە دروستو رەسەنەی وەرگرت، ئەوە دەبێتە مایەی دروستبوونی ئارامیو خۆشگوزەرانیو بەختەوەریو سەقامگیری لەناو ژیانو کۆمەڵگە، پاڵنەری سەرەکی بۆ فەراهەمبوونی ئەو هۆشیاریو پەروەردە ئیمانیو عەقیدەییە، کە ئامانجەتی تاکێکی سالح دروست ببێ، تا کیانو کۆمەڵگەیەکی نمونەییو گونجاوی لێ پێك بێ، کە لەسەر ئاستی پێشکەوتنی شارستانیو زانستیەوە گەشە بکات.

---

[1] - النظم الاسلامیة: ٣٦٤

خوای گەورە ئیماندارانی کردۆتە تەواوکەرو راست کەرەوەی یەکتری و بە پێویستی زانیوە لەنێو خۆیاندا هەمیشە فەرمانی چاکەو خێر بلاویکەنەوەو رێگری لەهەر کارو هەنگاو و نەگەرێك بگرن، کە دەبێتە مایەی پشێوی و نارێکیەوە، هەروەکو دەفەرموێ: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)[1]، واتە: ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیرو هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفەتیانە): فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن ونوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتی مالێشیان دەبەخشن و گوێرایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لە ئاییندەدا خوا رەحمیان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەراستی خوا بالادەست و دانایە.

هەروەها دەفەرموێ: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)[2]، واتە: پێویستە لە ئێوە ئومەتێك پێك بێت، یاخود با هەمووتان ئومەتێك بن، کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باوو دروست، قەدەغەی هەموو نادروستیەك بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

بەو پێیە دەتوانین بلێین، کە هەبوونی هۆشیاری پێویست و پەروەردەی رەسەن، دەبنە مایەی پاراستنی ئەمن و ئارامی، واش دەکا خەلك لە کاری نادروست و تێکدەرانە دوور کەوێتەوە، بۆیە ئەرکی هەموو بانگخوازو رێنمایکارێکی ئیسلامیە، کە ئەرك بکێشن لە پێناو ئەو پەروەردەو هۆشیاریە، تا سیمای جوانی کۆمەلگەی موسلمانان بە ئەمن و ئارامیەوە بهێنێتەوەو، لەئەگەری کەوتنەوەی ناهەمواری بەدوور بێت[3].

---

[1] - التوبة: ٧١
[2] - آل عمران: ١٠٤
[3] - قضية الأمن في الواقع الاسلامي: ٣٦

# باسی چوارەم
# کـــارو هـەنگـاوی خـێر

بە پێی پێوەرە شەرعیەکان ئامانج لە دروستبوونی کەسـایەتی دیندارانـەی موسـڵمان، بـۆ ئەوەیە ببێتە مرۆڤێکی پاك لە ناخداو ئـەو پاکیـەکش ببێتـە وێسـتگەی هـەبوونی نیـەتو ئەنجامدانی خێرو رەنگدانەوەی بەسەر کردارو رەفتارو گوفتارەوە.

ئیسلام لە مرۆڤی دەوێ خۆی برازێنێتەوە بە هەرچی سـلوكو هەڵسـوکەوتی جـوانو بـاش هەیەو، لەپەنای ئەوەش خۆی بەدوور بگرێ لەهەر جوڵەو کارو هـەنگاوێك، کـە مـەترسـی بـۆ لایەنی ویژدانیو ئیمانیو دونیاییو دوارۆژ تێدا بێت.

کاری هەموو پێغەمبەران (سەلامی خۆیان لەسەر) لـەپێناو ئـەنجام دانـی خێـرو نانـەوەی هەنگاوی خێرو بەجێهێشتنی خێر بووە، وە داوای هەموو پەیامە ئاسمانیـەکان لـە مرۆڤایـەتی هەڵبژاردنی رێگەی خێر بووە، ئەوەی ئیسلامیش بە پێویستی دانـاوە لەسـەر شـوێنکەوتووانی رێبازەکەی هەر کردنی خێر بووە، هەموو ئامانجەکەش بۆ ئەوەیـە لـەرێی ئـەو خێـرەوە خێـری مرۆڤایەتیو خاكو نیشتمان بێتە دیو دەستەبەر بێت، کە خۆی لـە بەقـەرار بـوونی ئاشـتیو ئەمنیەتو ئارامی دەبینێتەوە.

لەبەر ئەوە خوای گەورە بە شێوەی ئەمر فەرمان دەکاو دەفەرموێ (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**[1]، واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کڕنووشو سوژدە بـەرن و (نوێـژەکانتان بـەجوانی بکـەن) و پـەروەردگارتان

[1] - الحج:٧٧

بپەرستن لە هەموو بارودۆخێکداو تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری‌و خێر ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن.

(وَافْعَلُوا الْخَيْرَ) واتە هەرچیەك خێر بێت لە خواپەرستی‌و رەوشتی جوان‌و بەرزو بەجێگەیاندنی پەیوەندیە خزمایی‌و کۆمەڵایەتیەکان ئەنجامی بدەن، کە ئەمە گرنگترین پاڵنەری دەروونی‌و کۆمەڵایەتین بۆ هێنانە کایەی کیانێکی نارام‌و هێمنەوە[1].

یان دەفەرموێ: (فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا)[2]، واتە: پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکاندا، روو لە هەر کوێ بکەن و لە هەر کوێ بن خوا هەمووتان کۆ دەکاتەوە.

لە دەقێکی تر دەفەرموێ: (وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ)[3]، واتە: هەر خێرو چاکەیەکیش ئەنجام دەدەن، دڵنیابن کە خوا زاناو ئاگادارە لێی.

کەواتە ئەنجامدانی خێرو گرتنە بەری هەنگاوی خێر، چەندین شێوەو رێگەو ئاستی جۆراوجۆری هەیە، سەرەنجام دەبێتە هۆیەکی گرنگ لە دروستکردنی رایەڵەی ئەمن‌و ئارامی لە وڵاتدا.

***

[1] ـ التفسير المنير: ب/٩ ل/٣٠٨
[2] ـ البقرة، ١٤٨
[3] ـ البقرة: ٢١٥

# بەشی پێنجەم

# ڕێکارەکانی پاراستنی ئەمن و ئاسایش

## دەروازە..

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا، رێنمایی و هەڵوێست و ئامۆژگاری ئیسلام بوو، سەبارەت بە چۆنیەتی دەستەبەربوونی ئەمن و ئارامی کیان و کۆمەڵگە، ئیدی وەك چۆن ئەو هۆکارانە بۆ دەستەبەربوونی ئەمن و ئاسایش پێویست بوون، بەهەمان شێوە پاراستن و راگرتنی ئەو ئەمنیەتە ئەرکی سەر شانی تاك بەتاکی کۆمەڵگەیە، لەگەڵ ئەوەش وا پێویست دەکات هێزێك هەبێ ئەو ئەمن و ئاسایشە بپارێزێ و رێگە نەدا کەس دەستی بۆ درێژ بکات[1]، لەبەر ئەوە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بەوە کردووە، کە پێویستە لەسەر موسڵمانان هێز ئامادە بکەن بۆ ئەوانەی دەیانەوێ ئاسایشی وڵات بشێوێنن، هەروەك دەفەرموێ: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تُظْلَمُونَ)[2]، واتە: خوا فەرمان دەدات بەکار بەدەستانی موسڵمانان هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەیی بکەن (هێزی ئاسمانی و دەریایی و وشکانی...هتد) و لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکانی تری گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن، با کەسانی تریش جگە لەم دوژمنانەی ئێستا، پێی چاوترسێن بن کە ئێستە ئێوە نازانن کێن و نایانناسن، بەڵکو هەر خوا خۆی دەیانناسێت و هەر شتێك ببەخشن لە پێناوی خوادا (بۆ بەهێز کردنی سوپای ئیسلام)، ئەوە بەزایە ناچێت و دەستان دەکەوێتەوەو ئێوە ستەمتان لێناکرێت.

---

[1] - السنن الإلهية: ٤٧
[2] - الأنفال: ٦٠

لەگەڵ ئەوەش بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان، لەکاتی رووبەڕوو بوونەوەی ئەگەرەکان، ئیمامو پێشەوای موسڵمانان بۆی هەیە کەسێك وەك چاودێرو هەواڵهێن دیاری بکات، بۆ ئەوەی زانیاری و پلانی دوژمن وەربگرێت، ئیدی هەر هۆکارێکیش بۆ ئەو مەبەستە بگیرێتە بەر دروستە، بەو مەرجەی ئەو هۆکارە پێچەوانەی شەرع نەبێ و زیان لە بەرژەوەندی گشتی نەدات[1].

ئەو ئامادەباشی و راهێنان کردنە لەبەر ئەوەیە، کە مەسەلەی ئەمن بە گرنگترین داخوازی و پێویستی ژیان دادەندرێت، وە هیچ ئامانجێك بێ بوونی ئارامی بۆ مرۆڤو کۆمەڵگە سەر ناگرێت، تەنانەت بەرژەوەندیە تایبەتی و گشتیەکانیش دوور لە ئەمنیەت بەرجەستە نابن و، بگرە جۆرێك لە بێ ئومێدی و سەرگەردانی رووبەڕووی تاکەکان دەبێتەوە.

لەبەر ئەو زەرورەتەیە ئیسلام پلان و بەرنامەی دارشتووە بۆ فەراهەم بوونی ئەمن و ئاسایشی کۆمەڵگەو بە پێی زەمەن و شوێن و هەڵکەوتەو پێکهاتەی کۆمەڵگەکان، پلان و رێکاری گشتگیرو تایبەتی بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش دیار کردووە، پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی هۆشیارو ژیر پارێزگاری لە ئاسایش و هێمنی وڵات بکات و، ئەو پەڕی کۆشش لەو پێناوەدا بنوێنێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەش پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاو بکرێن:

---

[1] ـ فقه السيرة: ل/١٧٣

## یەکەم: پابەندی دینداری و ئیمانی

هەبوونی ئینتیمای ئایینی و پابەندی ئیمانی و پارێزگاریکردن لە مەقاسیدەکانی شەریعەت و جێبەجێ کردنی یاساو بنەماکان و دەرهاوێشتە ئەرێنیەکانی چەمکی ئیسلام، هۆکارێکە بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش و زامنی مانەوەی ئارامی و هێمنی دۆخی کۆمەڵایەتی و نەتەوەییە لە وڵاتدا.

چونکە وەك پێشترین ئاماژەمان پێ دا، ئیمان لە ئەمنەوە هاتووەو گەورەترین هۆکاریش بۆ ئەمن ئیمانە، هەر خۆی ئیمان لەڕووی زمانەوانیدا لە ئەمنەوە وەرگیراوە کە دەکا پێچەوانەی ترس، بۆیە ئەوەی پابەند بێ بە ئیمانەوە خوای باڵا دەست لای خۆیەوە زەمانی ئەمنیەتی بۆ قەرار داوە، هەروەك دەفەرموێ: (**الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الْأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ**)[1]، واتە: ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوەو ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسوودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانەیە، هەر ئەوانەش ڕێنموومایی کراون.

یان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وەها پێناسەی کەسێتی ئیماندار دەکا، کە مایەی ئەمن و ئارامی بێت بۆ خەڵکی، هەروەك دەفەرموێ: (**الْمُؤْمِنُ مَن أَمِنَهُ النَّاس على أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ**)[2]، واتە: ئیماندار ئەو کەسەیە، کە خەڵکی لە سەرو ماڵیان لێی ئەمین بن.

ئارامی و بەختەوەری ژیان لە ئەنجامی کاری باشەوە دروست دەبێ، هەروەك کاری باش لە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرێ و جوانترین پاداشتیشی بۆ دادەندرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (**مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ**

---

[1] - الأنعام: ٨٣

[2] - سنن ابن ماجة: ب/٢ ل/١٢٩٨

مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)[1]، واتە: ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کـرد بێـت، پیـاو بێـت یـان ئـافرەت، لەکاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیـادا دەیـژێنین، لـە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

لەو سۆنگەوە ژیان و ئەمن و ئیمان وەك سێ چەمکی پێکەوە گرێـدراو، هۆشـیاری دەدەنـە مرۆڤ، کە وابەستەی هەرسێکیان بێ و هاوسـەنگی لـە نێوانیـان بخـولقێنێ، لێرەوەیـە کەسـی ئیماندار هەمیشە پاراستنی ئەمن و ئاسایش بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت و، دیاریشە کە مەنزومەی ئیمان، زامنی ئەو پاراستنە دەکات و هێڵی سوور لەبەردەم ئیمانداران دادەنێت.

ئەمنی تاکە کەسی لەوە دروست دەبێ، کە لە خۆی و ماڵ و ئابڕو و عـەقڵ و دینـی ئـەمین بێ و کەس پەنجەی ستەمی بۆ درێـژ نـەکات، ئەمـەش لـە رێـی جیبـەجێ کردنـی ئـەحکامی شەعیەوە دروست دەبێ، کە پاراستنی سەرو گیان و ماڵی هاوڵاتیان بە واجب و ئەرك دەزانێت.

لەلایەکی تریشەوە ئیمان هۆکارە بۆ پاراستنی مەقاسیدەکان و جێبەجێ کردنی سیسـتەمی سزاو تاوان، کە دواتر باسی لێوە دەکەین، هەر کات ئەو سیستەمە کەوتە سەرپێ و بە تەواوی و رێکیەوە پەیڕەو کرا، دەبێـتە مایەی زەمینەسازیەکی بەرفراوان بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسـایش، چونکە ئەگەر رێگری لە خراپـەو خراپیـەکان گـیراو چوارچـێوەی تاوانـەکان تەسـك بوویـەوە و سزاکان توند کران، خەڵك کەمتر دەکەوێـتە داوی سەرپێچـی و لێپێچـینەوە، ئەمـەش دەبێتـە هۆی سەلامەتی ئاسایش و ئەمنیەتی وڵات.

---

[1] ـ النحل: ٩٧

## دووەم: فەرمان کردن بە چاکەو رێگری کردن لە خراپە

یەکێ لە بنەما گرنگەکانی ئیسلام بۆ ئیسلاحو بەرەو پێش بردنی کۆمەڵگە، فەرمان کردنە بە چاکەو رێگری کردنو قەدەغەکردنی خراپەیە، سیماو دەرکەوتەی کۆمەڵگە لە تێروانینی ئیسلام لەوەوە خۆی دەبینێتەوە، کە تاکەکانی ئامرازو رێکاری چاك لە نێو خۆیاندا دروست دەکەنو، هەر خۆشیان دەبنە بەربەست لەکەوتنەوەی ئەگەرو هەرەشەو کارە خراپەکانەوە، لەسەر ئەو میتۆدە کۆمەڵگە هەمیشە بە ئاراستەی باش بوونو پێشکەوتنو سەقامگیری دەڕوات، چونکە ئەگەر کۆمەڵگە رێگەی چارەسەری گرفتەکانی گرتە بەر، ئەوە زۆر بەئاسانی دەتوانێ باش بوونو پێشکەوتن پەرە پێ بدات، بەوەش کۆمەڵگە لە کەشێکی جێگیرو ئیجابی خۆی دەبینێتەوە.

فەرمان بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە بە یەکێ لە گرنگترین ئەو فاکتەرانە دادەدنرێت، کە کەشێکی لەبارو ئیجابی دەخولقێنێو کۆمەڵگە دوور دەخاتەوە لە دەرکەوتنی دیاردە ناشارستانیو سەرپێچیەکانەوە، ئەمەش کاریگەری راستەوخۆی دەبێ بۆ سەر باری ئارامی کۆمەڵگەو، سەرەنجام پلانێکی تۆکمەی کۆمەڵایەتیە کە دەبێتە زامنی ئەو ئاسایشو ئەمنیەتەی بوونی دەبێ.

ئیسلام لە دوو توێی قورئانو سوننەتدا بانگەشەی جدی دەکا بۆ کارکردنو بەربڵاوی بنەمای (فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپ)ە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)[1]، واتە: پێویستە لە ئێوە ئومەتێك پێك بێت، یاخود با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگەواز بکەن بۆ

---

[1] - آل عمران: ١٠٤

خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باوو دروست، قەدەغەی هەموو نادروستیەك بکەن، تا ئەوانە هەر سەرفرازن.

یان دەفەرموێ: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ)[1]، واتە: ئێوە چاکترین ئومەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن.

ئەو تەرکیزو جەخت کردنەوە لەو بنەما گرنگە لە تێروانینی ئاییندا، لە پێناو دۆزینەوە رێگەی گونجاو و بایەخدانە بە سەلامەتیو ئەو رێڕەوە سەرکەوتووەی، کە دۆخی کۆمەڵگە بەرەو کەناری ئارامیو ئەمنیەت دەبات.

## سێیەم: گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا

یەکێکی تر لەو خاڵە گرنگو هەستیارانەی ئیسلام باسی لێوە کردووەو دەیەوێ موسڵمانان لێی هۆشیار بن، مەسەلەی گوێڕایەڵی کردنی فەرمانڕەوای موسڵمانانە لە هەموو ئەو کارو هەنگاوانەی دروستنو لەگەڵ رۆحی ئیسلام یەك دەگرنەوە، چونکە هەر دەوڵەتێك یان هەر کیانو کۆمەڵگەیەك ئەگەر گوێڕایەڵی تێدا بەدی نەکرێ، ئەوە سەر دەکێشێ بۆ دروستبوونی ئاڵۆزیو سەرهەڵدانی پشێوی لە ناو کۆمەڵگەوە.

چەندین دەق هەیە باس لەو پرسە دەکاو هانی موسڵمانان دەدات گوێڕایلی فەرمانڕای خۆیان بکەنو، ئارامی لەسەر بگرنو بەردەوامیش ئامۆژگاریو نزای خێری بۆ بکەن، هەروەك بەشێك لە زانایانی پێشوو فەرموویانە: ئەگەر بزانین یەك دوعامان لێ وەردەگیرێ لە لایەن خواوە، ئەوە بۆ دەسڵاتدارو فەرمانڕەواکان دەیکەین[2].

---

[1] ـ آل عمران: ١١٠
[2] ـ أمن البلاد: ٣٠

خوای گەورە لە قورئاندا هێمای بۆ ئەوە کردووەو دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا)[1]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەر بێت) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.

هەروەها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ فإنه من يَعِشْ مِنْكُمْ يَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا)[2]، واتە: فەرمانتان پێ دەکەم، کە لەخوا ترس بن و گوێڕایەڵ و پابەندی فەرمانڕەواکانتان بن با کەسێکی حەشیش بێت، چونکە هەر یەکێ لە ئێوە بژیێ کێشەو جیاوازی زۆر دەبینێ.

لە ریوایەتێکی تر هاتووە، دەفەرموێ: (على الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إلا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فلا سَمْعَ ولا طَاعَةَ)[3]، واتە: گوێڕایەڵی و فەرمانبەری لەسەر ئینسانی موسڵمانە لەهەر شتێکدا پێی خۆش بێ یان نا، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە کردنی تاوانێك ئەگەر فەرمانی پێ کرا بۆ ئەوە، نە گوێ گرتنی لەسەرە نە فەرمانبەری.

یان دەفەرموێ: (عَلَيْكَ السَّمْعَ وَالطَّاعَةَ فِي عُسْرِكَ وَيُسْرِكَ وَمَنْشَطِكَ وَمَكْرَهِكَ وَأَثَرَةٍ عَلَيْكَ)[4]، واتە: پێویستە لە سەرت گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای موسوڵمانان بیت و، فەرمانیشیان

---

[1] - النساء: ٥٩
[2] - سنن الترمذي: ب/٥ ل/٤٤
[3] - صحيح مسلم: ب/٣ ل/١٤٦٩
[4] - صحيح مسلم: ب/٣ ل/١٣٦٧

بەجێ بێنیت لە خۆشیو ناخۆشی، لەکاتێکدا کە گورجیو حەزی لێدەکەیو لە کاتێکیشدا کە حەز ناکەی، لە کاتێکدا کە مافەکانیشت پێشێل دەکات.

ئەو دەقانە ئاماژەی روونن لە مەڕ گوێڕایەڵی نواندن بەرامبەر بە کاربەدەستو فەرمانڕەوای موسڵمانان، چونکە هەر کات ئەو دابە بووە نەریتو خەڵك لە سەری رۆیشت، ئەوە دەبێتە هۆی پاراستنی ئەمنو ئاسایشی نەتەوەیی، هەر کاتیش خەڵك پابەندی ئەو رێنماییە ئاینیە نەبوو، ئەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی ئەمنیەتو دروستبوونی پشێوی لەناو کۆمەڵگەوە.

## چوارەم: لێبوردەییو پێکەوە ژیان

هەبوونی گیانی لێبوردەییو هەستی پێکەوە ژیان لەناو هەر کۆمەڵگەیەك، داخوازیەکی هەمیشەیی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، لەگەڵ ئەوەش رەوشتو بەهایەکی گرنگو بنەماو فاکتەرێکی بەهێزە بۆ پاراستنو راگرتنی ئەمنو ئاسایش.

چونکە گیانی لێبوردەیی ئیرادەو زەمینەی سازان لەناو کۆمەڵگە بەرووی تاکەکان دەکاتەوەو، هەرچی رقو کینەو تورەییو لێکترازانو پێکدادانی فکری هەیە کەم دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە هەر کات کۆمەڵگە گیانی لێبوردەیی تیا نەما، ئەوە توندو تیژی لێ کەوێتەوەو سەرگەردانیو دابەشبوونو بەرەی تورەییو رقو کینە بەدوای خۆیەوە دێنێت، ئیدی ئەگەر توندوتیژی کەوتەوە رەنگە ئاسان نەبێ ژیان بە ئاسایی بڕوا بەڕێوە، بۆیە ئەگەر سەیری کۆمەڵگەی سەردەمی سەرەتای ئیسلام بکەین، دەبینین گیانی لێبوردەیی زۆر بە زەقی رەنگی دابووەوەو توندو تیژی بە رێژەیەکی زۆر باش دابەزی بوو.

لەلایەکی ترەوە ئیسلام لەپێناو نەهێشتنی ئەنانیەتو خۆسەپێنیو رەفزی بەرامبەر، بیری پێکەوەژیانی داهێناو بانگەشەی بۆ کرد، تا بەهۆیەوە تاك بەو ئاراستە بیر بکاتەوە ئینتمای بۆ کیانو کۆمەڵگە هەبێ، نەك خۆی لە بەرەی دوورە پەرێزیو تاکڕەویو داخراوی مەلاس بدات.

خوای گەورە لە قورئانی پیرزدا هۆشیاری لەبارەی هەردوو چەمکی لێبوردەیی و پێکەوە ژیان بە پێویست دادەنێ، هەروەك دەفەرموێ: (خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ)[1]، واتە: کاری ئاسان لەخەڵکی داوا بکەو چاوپۆشی لە هەڵەو کەموکوڕیەکانیان بکەو لێبوردە بە، فەرمان بدە بە چاکەو کردەوەیەك کە پەسەندی شەرعە، رووش وەرگێڕەو پشت بکە لە نەفام و تێ نەگەیشتوان.

یان دەفەرموێ: (الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[2]، واتە: ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، رق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبووردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکارو چاکەخوازانی خۆش دەوێت.

کەواتە بە پێی فەرمانی ئایینی گیانی لێبوردەیی و پێکەوەژیان، سیمایەکی جوان و پێویست و دانەبڕاوی کۆمەڵگەی موسڵمانانە، کە بەهۆیەوە خەڵك هەست بە ئاسوودەیی دەکەن و ئەمانی کۆمەڵایەتیان بۆ دەستەبەر دەبێ، ئەمەش دەبێتە لایەنێکی هاوکار بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامی.

## پێنجەم: هەستی پارێزگاری گیان و کۆمەڵگە

خەسڵەتێکی تر لەو بەها گرنگانەی ئیسلام باسی لێوە کردووە، دەبێتە مایەی خێر بۆ خەڵك و سەلامەتی ژیان و فەراهەم بوونی ئەمنیەتی کۆمەڵگە، بریتیە لە هەبوونی هەست و هۆشیاری پێویست لەمەڕ پارێزگاری کردن لە گیان و نەتەوەو نیشتمان.

[1] ـ الأعراف: ١٩٩
[2] ـ آل عمران: ١٣٤

لە دیدی ئیسلام ئەو پارێزگاریکردنە نەك تەنها کارێکی باشە، بەڵکو ئەرکێکی پیرۆزو پێویستە، چونکە پارێزگاریکردن لە خاك و خەڵك بە بەشێك لە مەنزومەی قیەمی دینداری و ئەخلاقی تاك لەناو کۆمەڵگە هەژمار دەکرێ.

ئیسلام دەخوازێ هەموو ئەو رەفتارو کردە جوان و سەنگینانە پەرەیان پێ بدرێ، کە یارمەتیدەرن لە پتەوکردنی پەیوەندی نێوان تاك بەرامبەر خودی خۆیی و خەڵك و خوای گەورە، بۆ ئەوەی لەو رێیەوە بزانێ کە کاری چاك و رەوشتی بەرز کامانەن، قورئان بۆ هەڵسەنگاندنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وەسفی رەوشتە بەرزەکەی دەکات و دەفەرموێ: (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ)[1]، واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر رەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەندو بێ وێنەو مەزنیت..

هانی شوێنکەوتووانی دەدا بە ئاستێکی بەرزو چاکەوە مامەڵە بکەن و دەفەرموێ: (وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ)[2]، واتە: بێگومان چاکەو خراپە وەك یەك نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بەجوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپەو نادروستی بکە.

دوور خستنەوەی کۆمەڵگە لە مەترسی و بڵاوبوونەوەی دەردو نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکان ئەرکە لەسەر شانی موسڵمان، وە دەبێ رێگە نەدات ئەو دیاردە خراپانە تەشەنە بکەن، هەم بۆ پارێزگاری لە کۆمەڵگە، هەمیش بۆ رەخساندن و پاراستنی ئەمنی قەمی و ئاسایشی نیشتمان.

ئیسلام هەمیشە بانگەشەی ئەوە دەکا، کە کۆمەڵگە دوور بێ لە ئیرەیی و دووفاقیەت و گەندەڵی و بەرتیل و...هتد. لەبەر ئەوەی هەر یەك لەوانە کاریگەری نەرێنی دروست دەکەن، سەرەنجام تێکدان و لێکترازان و رق و کینەو لێکخوێندن و لاوازبوونی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی لێ دەکەوێتەوەو، زیان و مەترسی بۆ سەر ئەمنیەت لێ بەرهەم دێت.

---

[1] - القلم: ٤

[2] - فصلت: ٣٤

بۆیە هەبوونی هەستی پارێزگاری کردن لە لای تاکەکان، خاڵێکی گرنگە بەلای ئیسلامەوە، بۆ ئەوەی تاك هەست بکات ئەو کیان و نیشتمانە ماڵی دووەمی ئەوەو، وەك چۆنیش ئەمن و ئارامی و رەفاهیەت و ئاشتی ماڵی یەکەمی دەپارێزێ، بەهەمان شێوە ئەرکە پارێزگاری لە ماڵی دووەمیش بکات، تا خۆی و ماڵ و بەرژەوەندی و دەوربەری لە مەترسی بەدوور بێ و ئاسایشی بەقەرار بێت.

## شەشەم: پلان و دانایی لەکاتی ئاڵۆزیدا

بەپێی قۆناغ و پێشهاتەکان هەر کۆمەڵگەو وڵاتێك ئەگەری رووبەڕوو بوونەوەی دۆخی ئاڵۆزو شێوانی ئەمنیەت و تێکچوونی باری ئارامی هەیە، بەڵام زۆر گرنگە ئەو کیان و کۆمەڵگەیە هۆشیارانە لەکاتی نائاسایی و ئەگەرە نەخوازراوەکان، ژیرانەو حەکیمانە مامەڵە بنوێنێ و رێکاری پێویست و پلانی ستراتیژی بگرێتە بەر، بۆ رێگری و تەشەنە نەکردنی رەوشەکەو تێك نەچوونی بواری ئەمنی.

لایەنی پەیوەندارو دەزگا مەعنیەکان دەبێ پلانی بابەتی و درێژخایەنیان لەو مەجالە هەبێ و، حیساب بۆ ئەگەرو پێشهاتە نەخوازراوەکان بکەن.

لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیش بە پێی رێنماییە جوانەکانی ئیسلام دەبێ تاك هۆشیارو بەئاگا بێت و، لەکاتی ئاڵۆزی و پشێویەکان نەبێتە مایەی خۆشکردنی ئاگرەکە، بەڵکو پێویستە لەسەرخۆ مامەڵە بکات، بەتایبەت لەو پرسانەی بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوستن بە لایەنی دینداری و هەستی موسڵمانێتیەوە، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ بڕیاری دروستی ئیسلام و ئەنجامدانی ئەو رێو و شوێنانەی دەبنە مایەی ئەمن نەك ئاڵۆزی.

ئەگەر لەسەر ئاستی گەڕەك و شار کێشەیەك هاتە پێشەوە، دەبێ بەرچاو روونی لەوەدا هەبێ کە چۆن رێگری لە کێشەکە بکرێ، نەك بە ئاقاری تێوەگلان و گەورە کردن و ئالۆزی و گەرمکردن ببرێت.

بە پێی زۆرێك لە بنچینە فیقهیەکان ناکرێ لەکاتی نائاسایی یان جەنگ یان دروستبوونی کێشە، ئالەت و چەکی کوشندە و شتی وا بفرۆشرێت، کە دەبنە مایەی ئالۆزترکردنی وەزعەکە[1].

ئەو رێگریە لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و سەلامەتی هاولاّتیان و کۆمەلّگەیە.

تەنانەت بەپێی رێنمایی ئیسلام و لەکاتی نائاسایی ناکرێ هەموو قسەو لێدوانێك بکرێ و بدرێ، بەلّکو دەبێ هۆشیارانەو بە حیکمەت و لێزانیەوە، بە پێی نەخشەیەکی تۆکمەوە بەرنامەرێژی و کاری پێویست بکرێت.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: (**وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا**)[2]، واتە: (لێرەدا خوا رەخنە دەگرێت لە هەندێك نیمانداران): هەر کاتێك هەوالّێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی، یاخود ترس و بیم، بلاّوی دەکەنەوە(بیر لە سەرئەنجام ناکەنەوە)، خۆ ئەگەر ئەو هەوالّەیان بلاّو نەکردایەتەوە و بیانگێرایەتەوە بۆلای پێغەمبەرو (درودی خوای لەسەر بێت)، یان بۆ لای کار بەدەستانێك کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کە لە نهێنی هەوالّەکان تێدەگەن و دەکۆلّنەوە، نهێنی و رازەکانیان لێ دەردەهێنا، جا ئەگەر فەزلّ و چاودێری خواو رەحمەت و میهرەبانیەکەی نەبوایە شوێنی شەیتان دەکەوتن، جگە لە کەمێکتان.

بە رامان و وردبوونەوە لەو ئایەتە دەگەینە ئەو راستیە، کە پەیامێکە بۆ هۆشیارکردنەوەی خەلّك و پەروەردەکردنیان لەمەڕ مامەلّەکردن لەگەلّ ئەو مەترسیانەی لەسەر دۆخی ئەمنی

[1] - أصول الفقه/ ١٧٩
[2] - النساء: ٨٣

وڵات دروست دەبن، بەتایبەت دەبێ موسڵمانان گوێڕایەڵ و پابەند بن بە فەرمانڕەواکانیان، وەدەبێ گوێ بۆ فەتوا و بڕیاری زانایانی ئیسلام شل بکەن، نەك هەر کەسەو بە میزاج و لەسەر بنەمای تاڵۆزکردنی وەزعەکان و بیرنەکردنەوە لە دەرەنجام و کاریگەری و دەرهاوێشتەکانی فەتوا دەر بکاو، خەڵکانێك تووشی سەرگەردانی و ماڵوێرانی دین دونیا بێن.

کەواتە هەبوونی هۆشیاری و پلان و لێزانی لەکاتی رووبەڕوو بوونەوەی ئەگەرە نەخوازراوەکان، دەبێتە هۆیەك لەو هۆکارانەی ئاسایشی کیان و وڵات دەپارێزێ، بەپێچەوانەشەوە هەڵچوون و زوو بڕیاردان و نەبوونی بەرچاو ڕوونی و بێ پلانی و پەلەکردن و کارکردن بە قسەی بێ بنەما، دەبێتە مایەی تێکچوونی ئارامی و ئەمنیەت.

## حەوتەم: نزا و سوپاسگوزاری

وەك پێشتر باسمان کرد، ئەمن و ئاسایش نیعمەتی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤەکان لەسەر زەوی، وە داوای لە مرۆڤەکان کردووە رەچاوی ئەو بنەما گرنگانە بکەن، کە دەبنە مایەی هێنانەدی و پاراستنی ئەمنیەت، چونکە هەموو جموجۆڵ و چالاکیە مەدەنی و سیاسی و زانستی و عورفیەکان بەستراوەتەوە بە هەبوونی ئەو نیعمەتە لە وڵاتدا، هەروەك ئیمامی جوەینی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ئەمن و سەلامەتی بنەمای خۆشی و لەززەتی گشت نیعمەتێکن، وە بێ بوونی ئەو دوو بنەمایە هیچ خۆشیەك لە نیعمەتەکان ناکرێ[1].

خوای گەورە مانەوەو بەردەوامی هەر نیعمەتێکی بەستۆتەوە بە ئاستی سوپاس و پێزانینی بەندەکانی، کە ئەمە بنەمایەکی گرنگی قورئانی پیرۆزەو خوای گەورە دەفەرموێ: (وَإِذْ تَأَذَّنَ

[1] – غياث الأمم في التياث الظلم: ل/١٩٠

رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ)[1]، واتـە: لـە یادتـان بێـت کـە: پەروەردگارتان بڕیاری داوە، سوێند بەخوا ئەگەر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بن، رزق و رۆزی و نازو نیعمەتتان بەسەردا دەرژێنمو زیادی دەکەم، بەڵام: ئەگەر ناشـوکرو سـوپاس ناپـەزێر بـن، بەڕاستی ئەو کاتە ئیتر تۆڵەو سزای من زۆر بە نازار دەبێت.

بۆیە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) دوعایان کردووە، کە خوا ئەمن و ئـەمانیان پێ ببەخشێ، ئەوەتا پێغەمبەر ئیبراهیم دەیفەرموو: (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ) واتە: کاتێك ئیبراهیم نزای کردو وتی: پەروەردگارا، باڵی هێمنیو ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شارو وڵاتەداو خۆمو نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.

هەروەها پێغەمبەری ئێمە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي وَآمِنْ رَوْعَاتِي)[2]، واتە: خوایـە عەیبو عارم داپۆشە، خوایە لە ترسو تۆقین بمپارێزەو ئەمانم پێ ببەخشە.

دەبێ هەمیشە مرۆڤی موسڵمان لەبەرامبـەر ئـەو نیعمەتـە سوپاسـگوزار بێـتو، لەگـەڵ ئەوەش بەردەوام بپاڕێتەوەو دوعا بکات بۆ سەلامەتیو بەردەوامی ئەو ئەمن و ئارامیـەی لـە وڵات هەیە، چونکە نـزاو سوپاسـگوزاری دوو چـەکی مەعنـەویو رۆحـی گـرنگن لـە ژیـانی موسڵمانان بۆ دەستەبەربوونو پاراستنو بەردەوام بوونی ئەمن و ئاسایش.

بەڵام ئەگەر شوکرانە بژێری لەسەر نیعمەتی ئەمن نەکراو خەڵکیش سـست بـوون لـە نـزاو پاڕانەوە لەو بوارەدا، ئەوە لەوانەیە هەر خۆمان ببینە بەشێك لەو کارتانە، کە فشـاری خـراپ لەسەر رەوشی ئەمنی دروست دەکەن، چونکە خوای لەو بارەوە دەفەرموێ: ( وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ

---

[1] – ابراهیم: ٧

[2] – صحیح ابن حبان: ب/٣ ل/٢٤١

**الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ**) واتە: خوا نموونەی هێناوەتەوە (بە دانیشتوانی) شارێك كە ژیانیان بە هێمنی و ئاسوودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەكەوە رزق و رۆزی جۆراو جۆریـان بۆ دەهات (بەڵام لە جیاتی سوپاسگوزاریی) ناشوكرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەكانی خوا بـوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاكی برسێتی و ترسی كردە كاڵای باڵایان و تاڵاوی نەداریی و ترسی پـێ چەشتن لە سەر ئەنجامی ئەو ئیش و كارە (ناپوخت و نارێكانەدا) كە دەیانكردە پیشەی خۆیان.

## هەشتەم: هەست كردن بە بەرپرسیارێتی

پێویستە هەمیشە تاك بە شێوە فراوانەكەی لە ئەمنیـەت بڕوانـێ و ڕەچـاوی هـەموو ئـەو پێوەرو ڕێگایانەش بكات، كە لە ئارامی نزیكی دەكەنـەوە، هەسـت كـردن بـە بەرپرسـیارێتی بەرامبەر بەو پرسە، یەكێكە لەو خاڵانەی ئیسلام باسی دەكات و بە لایەنێكی پێویستی دەزانێ بۆ مەسەلەی ئەمنی نەتەوەیی.

لە روانگەی ئیسـلامەوە، دەبێ تاك دەرك بەو ڕاستیە بكات، كە پارێزگاری كردن لە ئەمن و ئارامی كیان و كۆمەڵگە بەرپرسیاریەتێكی دونیایی و قیامەتیە لەسـەر شـانی، لەبـەر ئـەوەی پاراستنی نیعمەتەكانی خوای گەورەو بەگـەورە زانینیـان واجبێكـی ئیمانیـە، لـەو سـۆنگەوە ئیشتمان و هەبوونی كیانێكی ئارام نیعمەتێكی سەنگینە لە ژیـانی ئینسـان، وە ئیشـتمان بـۆ هەمووانە هەروەك هەمووانیش سوود لە ئەمن و ئارامی وەردەگرن، بەڵام ئـەوە بەرپرسـیارێتی دەخاتە سەر شانی هاوڵاتیان بە مامۆستاو پزیشك و ڕۆشنبیرو میدیاكارو بـەرپرس و بازرگـان و پیشەدارو كاسب و كارمەندو هەر كەسێكی ترەوە.

هەروەكو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (**كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عـن رَعِيَّتِهِ الْإِمَامُ رَاعٍ ومسؤول عن رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وهـو مسـؤول عـن رَعِيَّتِـهِ وَالْمَـرْأَةُ**

رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا ومسؤولة عن رَعِيَّتِهَا وَالْخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ ومسؤول عـن رَعِيَّتِـهِ)[1]،
واتە: هەمووتان چاودێرن و بەرپرسیارن لە رەعیەتی خۆ، پێشەواو ئیمام چاودێرەو بەرپرسـە لـە رەعیەتەکەی، پیاو چاودرێرە بەسەر مـاڵ و منـاڵی و بەرپرسیشـە لێیانـەوە، ئـافرەت چـاودێرە بەسەر ماڵ و منداڵی مێردەکەیەوەو بەرپرسە بەرامبەریانەوە، خزمەتکار چـاودێرەو لێپرسـراوە بەرامبەر ماڵی گەورەکەی و بەرپرسە لە رەعیەتەکەیەوە..

ئەو جۆرە شیکارو دابەش کردنەی بەرپرسیارێتی دەگەرێتەوە بۆ هەستیاری و پێویستی ئـەو رۆحیەتـە، بـۆ پیـادەکردن و بـەرپا کردنـی ئـەمن و ئـارامی و، خـۆ بەخـەخۆردانان بەرامبـەر نەشێواندن و تێك نەدانی.

ئیمانداری راستەقینە هەستی بەرپرسیارێتی زیندووەو پارێزگاری لە خـاك و خـەڵكی خـۆی دەکات و، بەردەوامیش رێگری لە هەر کارو هـەنگاوێك دەکـا، کـە مەترسـی لەسـەر رەوشـی ئەمنی دروست بکا.

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا)[2]، واتە: (ئەی ئینسان) لە شـتێك مـەدوێ و شـوێنی شـتێك مەکـەوە، کـە زانست و زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بەراستی دەزگاکانی بیسـتن و بیـنین و تێگەیشـتن هـەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە.

بەدیوێکی تر مرۆڤ لەسەر زەوی نیشتەجێ کراوەو ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی پـێ سـپێردراوە، وە هەموو شتەکانی بۆ فەراهەم کـراوە، لەبەرامبەریـدا لێیـان بەرپرسـەو دەبـێ بەشـێوەیەکی جوان و بەگیانی خۆ بەخاوەن زانی مامەڵە بنوێنێ، هەبوونی ئەو هەستە کە مـرۆڤ بەرپرسـیارە بەرامبەر ئەو خەڵکەی لەگەڵیان دەژی، یان ئەو زەویەی ژیـانی تێـدا بەسـەر دەبـا، یـان ئـەو

---

[1] _ صحيح البخاري: ج١ ص٣٠٤
[2] – الإسراء: ٣٦

ژینگەی نەفەسی ژینی تیا هەڵدەمژێ، وەك ئەرك بۆ مرۆڤ دیاری کراوەو ئیسلام دەیـەوێ وەك هەستو کردار کارا بێتو رەنگدانەوەی بەسەر جەستەی کۆمەڵگەوە دیار بێت.

ئەداکردنی چوارچێوەکانی هەستی بەرپرسیارێتی، وا دەکـا کۆمەڵگـە بکەوێتـە دۆخێکـی ئارامو پڕ لە سەقامگیریو ئەمنیەتەوە.

کەواتە بەرپرسیارێتی بەرامبەر پاراستنی ئاسایشی وڵات، ئەرکێکی شـەرعیو ئـەخلاقیو نیشتمانیە، ئەرکە هەمووان بێ جیاوازی پارێزگاری لە ئارامیو هێمنی بکەین، ئەرکە تێکڕای دامەزراوە حکومیو مەدەنیەکان رێکاری پێویست بۆ سەلامی ئەو پرسە رەچاو بکەن، چـونکە بەرپرسیارێتی ئەمنی نیشتمانی بەتەنها لەسەر دەزگا مەعنیـەکان نیـە، بـەڵکو داخوازیـەکی هەمیشەییو گشتیە لە تێڕوانینی ئیسلامەوە دەکەوێتە سەرشانی تاك بەتاکی کۆمەڵگە.

## نۆیەم: هاوسەنگیو بنەمای مامناوەندێتی

لایەنێکی تری بەها جوانەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەیە، هەمیشە بنەمای ئاسـانیو هاوسەنگیو میانڕەویو ئاشتیو مامناوەندیبوونی لـە ژیـان دەوێ، تەنانـەت لەسـەر ئاسـتی دینداری ئامانجیەتی تاك لەسەر رێڕەوێکی دروستو هاوسـەنگ ئیلتیـزام بـە دینـەوە بکـات، چونکە ئەوە سیمای ئۆمەتی ئیسلامەو بە رەنگدانەوەی ئەو سیمایەش مرۆڤو کیانو کۆمەڵگە دەکەونە ژێر باری رەحمەتی زۆرێك لە سەرکەوتنو بەختەوەربوونو هێمنیەوە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُـهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)[1]، بـەو شـێوەیەش ئێوەمـان بەگـەلێکی میانـەڕەو

---

[1] - البقرة: ١٤٣

گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبادەتو خواپەرستیەوە، لە ڕووی دنیاو قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازیەکانی ڕۆح و نەفسەوە..هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە (تا بزانن ئەم تاین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێرو سەربەرزیە بۆ تاکو کۆمەڵ لە هەموو سەردەمێکداو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێتو لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون).

ئەو تێگەیشتنە ڕێك لەهەموو بنەماو بنچینەو لقو پۆپەکانی شەریعەت ڕەنگدانەوەی هەیە، لەبەر ئەوە لە زۆر شوێنی قورئان باس لە پێویستی بوونی هاوسەنگیو کارکردن بۆ ڕاگرتنی کراوە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بەهۆیەوە هاوسەنگی نێوان دڵو عەقڵ، ماددیو مەعنەوی، کارو کردەوە، دینداریو دونیا، تاكو کۆمەڵ، ئەركو ماف، دونیابینیو دوارۆژ، بەشێوەیەکی هاوسەنگو ئیجابی ڕابگرێت، بۆ ئەوەی لە ئەرزی واقعدا زەمینەی ئەو تەوازونە بەرجەستە ببێ و هەر لەخودی خۆی کەسایەتیەکی مامناوەندی لێ بەرهەم بێت.

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ)[1]، واتە: هەوڵ بدە بەو ماڵو سامانەی خوا پێی بەخشیووی ماڵی قیامەتو بەهەشتی بەرین بکڕەو بەشی خۆیشت لە دنیادا بەحەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە، هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەسادو گوناهو تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت تۆوی خراپە دەچێنن.

هێمای ئەو دوو پەیامە قورئانیە وێنەی ئەوە نیشان دەدا، کە خوای گەورە ئوممەتی پێغەمبەری (درودی خوای لەسەر بێت) بەوە ناساندووە، کە ئوممەتێکی مامناوەندو بە

---

[1] – القصص: ٧٧

ئینساف و عەدالەتە، هەروەها پەیامی ئیمانداران دروشمێکی هاوسەنگە لە کارو گوفتاریان، بەشێوەیەك هەم رەزامەندی خوای تێدا بێت و، هەمیش لەپێناو دونیا قیامەتیان پەراوێز ناخەن.

بەو پێیە مرۆڤی ئیماندار ناکەوێتە ناو زەلکاوی هەڵچوون و رووچوون، زیادەرۆیی و کەمهێنان، چونکە لە دیندا زیادەرۆیی مەترسی زۆری لەهەموو روێکەوە بۆ تاك و کۆمەڵ لێ دەکەوێتەوە، وەك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئاماژەی بەو راستیە داوەو دەفەرموێ: (وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ)[1]، واتە ئاگادارتان دەکەم! وریا بن و خۆتان لادەن لە زیادەڕەوی و رووچوون لە دیندا، چونکە زیادەڕەوی لە ئاییندا خەڵکانی پێش ئێوەی بە هیلاك دا.

ئەو هۆشداری دانەی ئیسلام لەو بارەوە، بۆ هۆشیاری دانە بە کەسێتی موسڵمان، بۆ ئەوەی توخنی زیادەڕەوی نەکەوێ و هەنگاوێك نەهاوێژێ لەسنوور دەربچێ، بەڵکو پێویستە کەسێکی مامناوەند بێ لە ژیان و هاوسەنگ بێ لە کردەوەدا، چونکە ئەو بەهایە لە سەر ئاستی کۆمەڵگە بنەمایەکی گرنگە بۆ دەستەبەر کردنی ئاسایشی کۆمەڵ و کیان و وڵات و، هەنگاوێکی کاریگەرە بۆ پاراستنی ئەمنیەت بەهەموو جۆرێکەوە.

## دەیەم: دەستەبەری کۆمەڵایەتی و پاراستی مافەکان

ئیسلام لەچوارچێوەی سنووری شەرعی رێز لە ژیان و ماف و ئازادیەکانی مرۆڤ دەگرێت، لەو پێناوەش چەندین رێنمایی تایبەتی هەیەو هۆشیاری دەداتە شوێنکەوتووانی پێوەی پابەند بن.

---

[1] – صحيح ابن حبان: ب/٩ ل/١٨٣

لـە ئیسـلامدا یەکسـانی و مـاف و ئازادیـەکان دەبـێ پـارێزراو بـن و، تـاکرێ لەمافـدا کەمتـەرخەمی و لە ئازادی زۆرلێکردن بوونی هـەبێ، چـونکە لـەو حاڵەتـە کەشـێکی نالـەبار دروست دەبێ و پلانەکانیش بۆ پاراستنی کیان و کۆمەڵگە تەگەری سەرکەوتنیان لاواز دەبێ.

لەسەردەمی خەلافەتی ئیمانی ئەبوبەکر رەهەندێکی دیارو بەرچاوی کارویەرنامەکەی ئـەوە بوو، کە یەکسانی بەرپا بکاو بەیەك چاو سەیری هاوڵاتیان بکرێت، لەوەشدا هیچ جیاوازیـەکی نەخوازراوی لەنێوان بەندەو کۆیلەو، ئافرەت و پیاو، گەورەو گچکە نەهێشت، تەنانەت ئەوانەی لەدوای ساڵی فەتح موسڵمان بوون وەك ئەوانە حیسابیان بـۆ کـرا، کـە لەسـەرەتاوە موسـڵمان ببوون و لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کۆچیان کرد بوو.

لەسەر ئەوە کاتێ عومەری کوڕی خەتاب بەمەی زانی رەخنەی گرت و فەرمووی: ئایا چـۆن بە یەکسانی سەیری ئەوانەی هیجرەتیان کردووەو لەسەرەتاوە موسڵمان بوون! وەك ئەوانەی لـە ساڵی فەتح لەترسی شیر موسـڵمان بوونـە دەکـەی؟! لەوڵامـدا ئەبوبـەکری سـدیق فـەرمووی: ئەوانەی فەزڵی زۆریان پێ براوەو کارو کردەوەی چـاك و باشـیان کـردووە بـۆ خـوا کردوویانـەو پاداشتیان لای خوایە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانی کە دونیا جێگەی دابین کردن و پاراستنی ماف و رەوایەتی و یەکسانیە[1].

بۆیە لە تێڕوانینی ئیسلام دەبێ ژیان و گوزەران و پێداویستی و دەستەبەری کۆمەڵایـەتی بـۆ خەڵك فەرام بکرێ، بەتایبەت لەلایەن لایەنی پەیوەندارو حوکمڕانـەوە، رەخسـاندنی کەشـێکی گونجاو بۆ ژیانی تاك لەناو کۆمەڵگەو دابین کردنی پێویستیە بنەڕەتیـەکان و پاراسـتنی بنـەما گرنگەکانی ژیان و داکۆکی کردن لە ماف و ئازادیەکان، ئیسلام بۆ دەستەبەری کۆمەڵایەتی وەك فەرزێك هەژماری دەکات[2].

---

[1]- نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين: ل/٢١٤
[2] - أصول الدعوة: ٢٦٨

پارێزگاری لە مافە گشتیو تایبەتیەکان، بەتایبەت پاراستنی (دین) پاراستنی (ژین) پاراستنی (عەقڵ) پاراستنی (وەچەو نەسل) پاراستنی (شەرەفو ماڵ)، لەگەڵ پارێزگاری لە نیشتمانو زانستو دادپەروەریو یەکسانیو ئازادیو بەژداری کاروباری گشتیو راوێژو فەرمان بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە، نەك تەنها مافنو تەواو، مرۆڤ بیەوێ پابەند بێ یان دەستبەرداریان بێ، بەڵکو هەموو ئەوانە فەرزی خواییو داخوازی شەرعیو پێداویستی بنەرەتی ژیانن، ئیسلام بە واجبیان دادەنێ بۆ کاروباری دینو دونیایی، کە بێ بوونی ئەمانە ژیان مەیسەر نابێ، هەر واجبێکیش ئەگەر بێ هۆکارەکان دەستەبەر نەبێ، ئەوە لەبەر پێویستی هۆیەکانیش واجب دەبن[1].

بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ رێکخستنی ژیانو دەستەبەرکردنی مافو پێداویستیەکانی ژیان، دەیەوێ سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان رێكو گونجاو بن لەوانە:

## سیستەمی کۆمەڵایەتی:

ئیسلام لە رێی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تاكو دیارکردنی ئەركو نەبەزاندنی سنوورەکانو رێکخستنی پەیوەندیەکان سیستەمی کۆمەڵایەتی رێکخستووە، پێکهێنانی ژیانی خێزانیو رەچاوکردنی رێزو پاراستنی مافی دایكو باوكو خێزانو منداڵو دراوسێو دابین کردنی نەفەقەو دادپەروەریو برایەتیو رێزگرتنو خۆشەویستیو چاکەو هاوکاریو خێر...هتد، بەشێکی گرنگ لەو پرسانە پێك دێنن، کە ئیسلام رێکی خستووەو سنووری بۆ داناوە.

[1] - الإسلام والأمن الإجتماعي:٨٣

ئەو رێکخستە کۆمەڵایەتیە زەمانەتی ئەمنی کۆمەڵگە دەکات‌و، مەسەلەی ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەرەو پێشەوە دەبات، بەڵام کە نەتواندرێ وەك پێویست ئەو سیستەمە رێك بخرێ، مەترسی لەسەر ئەمنی کۆمەڵایەتی‌و نەتەوەیی دەنێتەوە.

## سیستەمی ئابووری:

شەریعەتی ئیسلام بایەخێکی زۆری داوە بە ماڵ‌و سامان‌و بگرە بۆ ئەو مەبەستەش چەندین رێکاری بۆ پاراستنی دیاری کردووە، خوای گەورە دەفەرموێ: (**وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا**)[1]، واتە: ماڵ‌و سامانتان مەدەن بەکەم عەقڵ‌و پیاو خراپان(کە ئێوە بەرپرسن لە ماڵیان)، لەکاتێکدا خوا کردوویەتی بەهۆی ژیان‌و پایەداری‌و هەستانەوەتان.

بۆ ئەو مەبەستەو رێکخستنی سیستەمی ئابووری، شەریعەت مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتن‌و بازرگانی بە کۆمەڵێك یاساو رێساوە دارشتووە، لە بەرامبەریشدا ریباو ئیحتیکارو فێڵ‌و.. هتد، قەدەغە کردووە، بۆ ئەوەی خەڵك لە چوارچێوەی زەمینەیەکی تەندروست‌و گونجاو لایەنی ماددی‌و ئابووری خۆی بەڕێوە ببا، بەو پێیە دەبێ سیستەمی ئابووری پارێزراو بێ، بۆ ئەوەی ئەمنی قەومی نەکەوێتە مەترسیەوە، ئەگەر ئەو جۆرە دەستەبەریەی ژیان بۆ تاك نەکرێ، کێشەو مەترسی لەسەر ئەمنی ئابووری دروست دەکات‌و بەرەو ئاڵۆز بوونی ئەمنی قەومی سەردەکێشێ، تەئمینی وزەو خۆراك‌و پێداویستی تری وەك ئاوو و کارەباو سوتەمەنی، وا دەکات ئاسان بێ کۆنترۆڵی مەترسیەکانی ئاسایشی نەتەوەیی بکرێ.

---

[1] ـ النساء: ٥

## سیستەمی سیاسی:

لە روانگەی ئیسلامەوە سیستەمی سیاسیو سەرپەرشتیو بەڕێوەبردنو حوکمڕانی لەسەر بنەمای متمانەو خۆشەویستیو پەیوەندی نێوان تاكو فەرمانڕەوا رێك دەخرێ، بەشێوەیەك رەچاوکردنی بەرژەوەندی دینیو دونیاییو پاراستنی بەرژەوەندیە گشتیەکانو دادگەریو رێگری لە ستەمو تاوان لەناو نەخشەو کارنامەی ئەو سیستەمە بوونی هەبێ.

بنەمای سەرەکی باشکردنی ئەو سیستەمە دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوون بە راوێژو بەرجەستەکردنی دادگەری کۆمەڵایەتیو وەستان لەدژی ستەم، هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا باسی لێوە کردووەو دەفەرموێ: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)[1]، واتە: کارو باریان هەردەم بە مەشورەتو راپرسی و راوێژکاریە.

یان دەفەرموێ: (إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)[2]، واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەریو چاکەکاریو یارمەتیدانو بەخشندەیی بە خزمانو قەدەغە لە گوناهو تاوانو دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵو نەفسو ناموس) و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

هەروەها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەو براەوە دەفەرموێ: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عن رَعِيَّتِهِ الْإِمَامُ رَاعٍ ومسؤول عن رَعِيَّتِهِ)[3]، واتە: هەمووتان چاودێرنو بەرپرسیارن لە رەعیەتی خۆتان، پێشەواو ئیمام چاودێرەو بەرپرسە لە رەعیەتەکەی.

---

[1] - الشورى: ٣٨

[2] - النحل: ٩٠

[3] _ صحيح البخاري: ج١ ص٣٠٤

سیستەمی سیاسی تاوتوێی دەستەڵاتی سیاسی و شێوازی دەستەڵات و چاودێری کردنی بەرژەوەندی گشتی و دادگاو شێوەی دیار کردنی بڕیاری سیاسی و دانانی سەرۆك و موشارەکەی سیاسی...هتد. دەکات.

گرنگترین بنەماش بۆ ئەمنی سیاسی متمانەی هاوڵاتیە بە دەستەڵات و لە هەمان کاتیشدا دەبێ دەستەڵات بوار بداتە هاوڵاتی کە تەعبیر لە بۆچوونی خۆی بکات، چونکە ئەگەر ئەو دەرفەتە نەدرێتە هاوڵاتی بۆچوونی خۆی دەربڕێ، بەرەو لادان و یاخیبون و توندو تیژی دەچێ و ئینتیمای بۆ نەتەوە نامێنێ، دواجار ئەمەش مەترسی لەسەر ئەمنیەتی وڵات دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەو سیستەمە بە شێوەیەکی پێویست و گونجاو رێکخرا، ئەوە دەبێتە کاریگەرترین کارت بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان.

لەگەڵ هەموو ئەو خاڵانەی پێشەوەو، کارکردن بۆ سەروەری یاساو یەکریزی و نیەتپاکی و دۆستایەتی و هاوکاری مرۆیی و ئەمانەتپارێزی، کە ئیسلام بە روون و رەوان هەڵوێست و تێڕوانینی خۆی لەبارەوە نیشان داوەو بانگەشەی بۆ دەکا، بە هۆکاری گرنگیان دادەنێ بۆ دەستەبەربوونی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی، چونکە ناو و ناوەرۆکی هەموو ئەو بنەمایانە دەگەڕێتە سەر یەك خاڵ، کە ئەویش جێبەجێ کردن و رەنگدانەوەیانە لەسەر ئەرزی واقع، سەرەنجام دەبنە زامنی پاراستنی ئەمنیەت لە وڵاتدا.

# باسی یەکەم
# ئەمنیەت و بایەخی سیستەمی سزاو تاوان

لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) زۆر شت هەیە باسی لێوە کراوە، کە تاوانەو زیانی بۆ مرۆڤو کۆمەڵگە تێدایە، بۆیە ئیسلام قەدەغەی کردووەو بەپێی ئاستو جۆرو قەبارەی تاوانەکەش سزای بۆ تاوانبار داناوە، ئەو دۆسیەی ئەنجام دانی تاوانو دیاری کردنی سزا، بە پێی زاراوەی فیقهی ئیسلامی پێی دەگوترێ: سیستەمی تاوانو سزا ( نظام الجريمة والعقوبة)[1].

خوای گەورە بۆ پاراستنی ئایینو گیانو نەژادو ماڵو عەقڵو ئابروو، چەند رێسایەکی تایبەتی داناوە، لەبەرامبەریشدا ئەگەر مەترسیان لەسەر دروست بوو ئەوە سزای توندو لەئاست قەبارەی سەرپێچیو مەترسیەکە دیاری کردووە، بۆ ئەوەی کیانی مرۆڤایەتیو دۆخی کۆمەڵایەتیو باری ئەمنی خەڵك سەلامەتو ئەمین بێ، بەپێی بنەما شەرعیەکان پاداشت لە شەریعەت دونیاییو قیامەتیە، ئەسڵیش لە پێدانەوەی پاداشت زیاتر پەیوەندی بە دوا رۆژەوە هەیە، بەڵام داخوازی فۆرمو پێداویستیەکانی ژیانو سەقامگیری کۆمەڵگەو رێکخستنی پەیوەندیەکانو پاراستنی مافو بەها مرۆییەکان، وا پێویست دەکا سیستەمی سزاو پاداشت هەم دونیاییو هەم قیامەتی بێت.

هەر وەکو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەو بارەوە دەفەرموێ: (مَنْ أَصَابَ من ذلك شيئا فَعُوقِبَ بِهِ في الدُّنْيَا فَهُوَ له كَفَّارَةٌ وَمَنْ أَصَابَ من ذلك شيئا فَسَتَرَهُ الله فَأَمْرُهُ إلى اللَّهِ إن شَاءَ عَاقَبَهُ وَإِنْ شَاءَ عَفَا عنه)[2]، واتە: هەر کەسێك لەو گوناهانە گوناهێکی کردو لە

---

[1] - المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية: ل/٣٣٢

[2] - صحيح البخاري: ب/٣ ل/١٤١٣

دونیا سزا درا، بەم سزا دانە تاوانەکەی لەسەر لاتەچێ، وە هەر کەسێك لەو تاوانانە تـاوانێکی کرد بەڵام لێی ئاشکرا نەبوو، ئەوە ئەکەوێتە لای خوا، ئەگەر حەز بکا لێی ئەبوورێ، وە ئەگەر حەز بکا سزای ئەدات.

بە پێی ئەو فـەرمودەو دەیاهـا دەقـی تـر، ئەگـەر کەسـێك زیـانو مەترسـی بـۆ بنـەما گرنگەکانی ژیان هەبێو تاوانێك ئەنجام بدات، وەك پێشتر باسمان لێوە کرد، ئـەوە دەبـێ خـۆی تەحەمولی بەرپرسیارێتیو سزایەکەی بکات، وەك چۆن ئێستا بە پێی یاساکان کەسی تاوانبـار دەبێ لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێو سزا بدرێت، کە ئەمە لەسەر دەوڵـەتو دەزگـا مەعنیـەکان ئەرکەو دەبێ پێی هەڵسن، بۆ ئـەوەی مەترسـی لەسـەر ئاسایشـی کۆمەڵایـەتیو نەتـەوەییو نیشتمانی دروست نەبێ.

لە دیدی ئیسلامەوە سزادان فاکتەری سەرەکی چارەسەری تاوان نیە، بەڵکو خۆپاراستنو رێ لێگرتن لە رێی قەدەغەکردنی هۆکارەکانیەوە یەکەم هەنگاوە، چونکە هەمیشە خۆپاراسـتن لـە چارەسەر چاکترو باشترە، بۆیە دەبێ لەناو هـەر کۆمەڵگەیـەك بـە توندی ئـەو بیرۆکەیـە رەت بکرێتەوە، کە داوای هەڵوەشاندنەوەی سزا جەستەییەکان دەکەن بە شێوەیەکی رەهایی[1].

چونکە هەر کات ئەو سیستەمە پاشەکشەی پێ کراو جێبەجێ نەکرا، ئـەوە دەبێتـە هـۆی تێکچوونی باری ئەمنی کۆمەڵگەو دروسبوونی ترسو دڵەراوکێ لەناو هاوڵاتیانـەوە، وە دەبـێ ئەوەش بزانین، کە سەرجەم سزاکان بەستراونەتەوە بە دوو بنەمای گرنگ:

یەکەم: دادگەری، واتە سزایەکە بە قەد باڵاو ئەندازەی تاوانەکە بێت، وەك خوا دەفەرموێ: (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا)[2]، واتە: تۆڵەی هەر تاوانێك بەئەندازەی تاوانەکەیە بێ زیادو کەم.

---

[1] - بەڵێننامەی ئیسلامی: ل/١٦٥

[2] - الشورى: ٤٠

دووەم: تەمبێ کردن، واتە سزادانەکە بۆ ئەوەیە تاوانبار هەست بەوە بکات تاوان سزای هەیەو جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر تاوانەکەی[1].

لەسەر ئەو بنەمایە، ئەگەر کەسێك تاوانێك ئەنجام بدات، وەکو تاوانی کوشتن‌و، زیناو، بوختان‌و، مەی خواردنەوەو، دزی کردن‌و، ڕێگریی‌و، زۆرداریی‌و، کافربوون‌و....هتد. ئەوە لەبەرامبەرداو بە پێی بنەماکانی شەریعەت دەبێ سزای خۆی وەربگرێت، چونکە ئیسلام دەیەوێ ئیسلاحی تاکەکان بکات‌و ڕێگری لە خراپیەکان بگرێت، بۆ ئەوەی سنوورە سوورەکان نەبەزێن‌و نەبنە مایەی تێکچوونی دۆخی ئەمنی هاونیشتمانیانەوە.

❋❋❋

[1] - اصول الدعوة: ل/٣٢٢

# باسی دووەم

# ڕۆڵی سیستەمی سزاو تاوان لە بەرقەراربوونی ئەمنیەت

بە پێی ئەو کورتە باسەی پێشەوە دەرەکەوێت، کە جێبەجێ کردنی سیستەمی سزاو تاوان بە یەکێ لە خاڵە سەرەکیەکانی پلانی ئیسلام لەمەڕ دەستەبەرکردنو پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگە دادەندرێت، لەبەر ئەوەی بەجێهێنانی فەرمانی خوای گەورەو بەسزا گەیاندنی تاوانباران، ڕۆڵێکی دیاری دەبێت لە سەقامگیری کۆمەڵایەتیو بنەبڕ کردنی تاوانو سەرکێشیەکان، کە بە نەمانو کەم بوونەوەی ئەو دیاردانە زەمینەیەکی گونجاو بۆ پێشکەوتنو گەشەکردنو ئاوەدانی وڵات دەرەخسێ.

بە پێی سەرچاوە فیقهیەکان[1]، مەسەلەی جێبەجێ کردنی سیاسەتی سزاو تاوان لەناو کۆمەڵگە بێ حیکمەت نیەو، بگرە کاریگەریو ڕۆڵی زۆر نیجابی دەگێڕێت لە گرتنە بەری سەرجەم ئەو ڕێو شوێنە پێویستانەی بۆ ئەمنیەتی وڵات ئەرکە بگیرێنە بەر، لێرەوە ئەگەر وردتر سەرنج بدەینە ئەو سیستەمە دەگەینە ئەو ڕاستیە، کە بەهۆی جێ بەجێکردنیەوە چەندین سوودی بۆ تاکو کۆمەڵ لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

**یەکەم:** کەمبوونەوەی تاوان لەناو کۆمەڵگە، واتە بەهۆی ئەو سیستەمەوە خەڵك کەمتر دەکەوێتە ناو سەرپێچیو تاوانو ستەمەوە، ئەمەش وا دەکا کۆمەڵگە پابەندی یاساو ڕێسای باو بێتو، دوور بێ لە گێرەشێوێنیو شڵەژانو فەوزا.

**دووەم:** بڵاوبونەوەی سەقامگیریو ئەمنیەت، چونکە ئەگەر کۆمەڵگە گیرۆدەی تاوان بوو، ئەوە خەڵك دەکەوێتە قەلەقیو لەرووی دەروونیو کۆمەڵایەتیەوە دەکەوێتە کەشێکی نالەبارەوە، بە

---

١ - الفقه الاسلامي وادلته: ب/٧ ل/ ٥٣٤٢

پێچەوانەشــەوە نــەمانو کەمبوونــەوەی تــاوانو سەرپێچــیەکان هۆکــارێکی بنەڕەتیــە بــۆ سەقامگیریو بەرپا بوونی ئاشتی کۆمەڵایەتیو ئاسایشی نەتەوەیی.

**سێیەم:** تەمبێ کردنی تاوانبار، کە ئەمەش خاڵێکە دەبێتە هۆی هۆشیار بوونەوەی خــەڵکانی تر لەمەڕ ئەنجام نەدانی تاوانو نەشکاندنی یاسای باوی وڵاتەوە، بۆیە لەگــەڵ نەشــکاندنی ئــەو یاسایە دەبێ لەناخەوە ترسی سزای قیامەتی لەبەر چاو بێو کاری خراپ دووبارە نەکاتەوە.

**چوارەم:** چاك کردنو راستکردنەوەی تاوانبار، لەوەشدا هەموو مرۆڤێك لە ناخەوە هەست بــەوە دەکات، کــە تــاوانی ئــەنجام دا خراپەیــەکی کــردووە، ئیــدی دەبــێ لــە پێنــاو پارێزگــاری لــە کەسایەتیو رێزو بەهای مرۆڤبوونی خۆی سەرکێشیو یاسا شکێنی نــەکات، ئــەوەش وا دەکــا ئەو کەسە چاك بێتو کەسایەتیەکەی بسازێتو گۆڕانی بەسەر دابێت.

**پێنجەم:** پاککردنەوەی کۆمەڵگە لە تاوان، کە ئەمە ئامانجێکی سەرەکی ئیســلامو جێبــەجێ کردنی سیستەمی سزاو تاوانە، لەبەر ئەوەی ئەمنی تاك بەشێکە لە ئەمنیەتی کۆمەڵگــە، وە ژیان بردنە سەر لەنێو پرۆسەیەکی ئاشتیانە ئامانجی هەر مرۆڤێکە، بۆیە ئەکتیڤ کردنــی ئــەو یاسایە زامنــی ئــەو ئــەمنو ئاشــتیەیەو، هۆکــارە بــۆ ســەلامەتی کۆمەڵگــەو بەرژەوەندیــە گشتیەکان.

**شەشەم:** بڵاوکردنەوەی هۆشیاری کۆمەڵایەتی، بــەوەی خــەڵك خۆیــان پێداچــوونەوەی خۆیــان بکەنو، عاقیبەتی ئەنجامدانی کاری ناشیاو و تاوانو دەســت درێــژی کردنــە ســەر بەرامبــەرو بەرژەوەندیە باڵاکان بزانن، وە دەبێ ئەوەش لەبەر چاو بگــرن، کــە خۆپاراســتن لــە چارەســەری باشترە، ئەنجام نەدانی تاوان لە کەوتنە داوی مەحکەمەو لێپێچینەوەی یاسایی ساناترە.

**حەوتەم:** کەمکردنەوەی زیانەکان، واتە ئەگەر بەهۆی ئەو یاسایەوە رێگری کرا لە تاوانەکان، ئەوە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خەرجیەکان، چونکە جاری وا هەیە بەهۆی لەناو چوونی ماڵ و وەستانی کارو پیشەو بەدواداچوون و گرتن و بەرەنگاربوونەوەو کردنەوەی دۆسیەو دادگایی و پۆلیس و کارمەندانی تایبەت بەو بوارە، خەرجیەکی یەکجار زۆر دەچێ و وزەیەکی زۆریش سەرف دەکرێ و بگرە کاتێکی زۆریش دەبا، ئەمەش وا دەکات وڵات بەشێکی خەرج و توانا و گەشە سەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی لەدەست بچێ و کەم بێتەوە.

**هەشتەم:** پارێزگاریکردنە لە کۆمەڵگە، بەوەی بەردەوام ئەو سیستەم و یاسایە هەوڵدەدات کۆمەڵگە بەدوور بێت لە تاوان و کردە ناشایستەو سەرپێچیە جۆراوجۆرەکان، لەگەڵ ئەوەش ئیسلام زۆر داکۆکی لە بنەمای دادگەری کۆمەڵایەتی و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی دەکا، بەوەی هەر تاکێك دەبێ پارێزگاری لە بەرژەوەندیە گشتیەکان بکاو، ئاگاداری بنەماو هۆشیاری شکاندنی سنوورە قەدەغەکراوەکان بێت.

**نۆیەم:** زامنی سەلامەتی ژیانە، چونکە بەپێی ئەو رێکارە هەر کەس هێرش بکاتە سەر کەسێکی تر، دەبێ لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێ، یان ئەگەر کەسێك کەسێکی تر بە ناڕەوا بکوژێت، ئەوە دەبێ لە تۆڵەی بکوژرێتەوە، ئەوەش وا دەکات ببێتە هۆکارێك بۆ دەستەبەرکردنی پتری سەلامەتی هاوڵاتیان و زامنی پاراستنی ژین و ژیانیان.

**دەیەم:** بەرتەسك کردنەوەی بواری تاوان، واتە ئەگەر سیاسەتی لێپێچینەوەو سزادان و رێگری کردن لە تاوان و سەرکێشی کارا بێت و، لەسەر ئەرزی واقع رۆڵی هەبێ و بە پراکتیکی جێبەجێ بکرێ، ئەوە بواری سەرپێچیەکان لەناو کۆمەڵگە زۆر بچووك و تەسك دەکاتەوە، چونکە ئەگەر تاك هەستی بەوە کرد هەموو تاوان و لادانێك سزای بۆ هەیەو کەس تاوان و بەرپرسیارێتی کەس

هەڵناگرێ، بە تەئکید هۆشیاری ئەوەی لا دروست دەبێ، کە خۆی بەدوور بگرێ لە خراپەو کاری تێکدەرانەو ناشیاو، ئەو هەنگاوەش وا دەکا بواری ئەنجامدانی تاوان کەم بێتەوە.

کەواتە کۆی ئەو خاڵانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە دانانی سیستەمی سزاو تاوان لە ئیسلامدا کارتێکی کاراو کاریگەرە بۆ زاڵ بوون بەسەر تاوانو تاوانباران، وە پلانێکی سەرکەوتوانەیە بۆ پاراستنی بنەما گرنگەکانی ژیانو چاودێری کردنی بەرژەوەندیە باڵاکانو بنەبڕکردنی کاری ناهەموار، وە هۆکارێکی گرنگە لە دەستەبەربوونی ئەمنو ئاشتی کۆمەڵایەتی، سەرەنجام ئەوەش پشتو پشتو زەمینەی زامنبوونی پاراستنی ئاسایشو ئەمنیەتی کۆمەڵگەو نەتەوە قایم ترو ئەستوورتر دەکات.

***

# باسی سێیەم
## شێواندنی دۆخی ئەمنی تاوانەو سزای هەیە

هەر کات سیستەمی ئەمنی کەم و کوڕی تێ کەوت و پایەو دیوارەکەی رووخا و تێکچوو، ئەوە دەیەها فیتەو ئاشوب و مەترسی و لێکەوتەی ترسناك لەناو کۆمەڵگە سەرهەڵدەدا، تەنانەت لە ئەنجامی شڵەژانی دۆخی ئەمنیەوە شەڕو کوشتارو تاوان و کاری نەخوازراو و خوێن ڕشتن ڕوودەدات، دیاریشە کە ئەو جۆرە تاوانانەو کوشتن و چەتەیی و گەندەڵی و خراپە بەرپا کردن، دەچنە خانەی تێکدانی ئارامی و ئاسایشەوە.

لەلایەکی ترەوە گوزەرانی خەڵك تێك دەچێ و توندوتیژی دروست دەبێ و، بگرە کارو پرۆژەو بەرنامەو بازاڕو ئاوەدانی و گەشەی ئابووری و دادگاو دادگەری و خوێندن و کەرتی تەندروستی و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و ماف و ئازادیەکان و بەرژەوەندیە گشتیەکان و تێکڕای ئیش و کارو پیشەو بوارەکانی ژیانی خەڵك پەکی دەکەوێ و دەکەونە بەر مەترسی و هەڕەشەوە.

لەبەر ئەوانەو چەندین هۆی تر، ئایینی پیرۆزی ئیسلام مەسەلەی ئەمن بە پایەکی گرنگ و گەورە دادەدنێت و ڕێنمایەی تایبەتیشی بۆ دەستەبەرکردنی هەیەو ڕێکاری زۆرو بۆریشی داناوە بۆ پاراستنی دۆخی ئەمنی لە هەر کات و ساتێکدا.

تەنانەت دەقی ڕاستەوخۆ هەیە لەبارەی پاراستنی پێنج مەقاسیدە پێویستەکە (الضرورات الخمس) کە بریتین لە دین و، ژیان و، عەقڵ و، شەرەف و، ماڵ و سامان، لەگەڵ ئەوەش ڕێکاری پێویست و گونجاوی داناوە بۆ پارێزگاری و دەستدرێژی نەکردنە سەریان و، سزای توندیشی بۆ ئەو کەسە دیاری کردووە، کە مەترسی لەسەر ئەو پێویستیانە (مەقاسیدانە) دروست بکات وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

بەجێبەجێ کردنی ئەو سزایانە زۆرێك لە کێشەکان چارەسەر دەبن، هەرچەند کەسانێك رەخنەی ئەوە دەگرن چۆن دەبێ ئیسلام هێندە توند بێت بەرامبەر تاوانبار؟ لەکاتێکدا بەزەییان بە کۆمەڵگە نایێتەوە کاتێ تووشی شڵەژان و شکاندن و شێواندن دێت! کە بەوەش ئەمن و ئاسایش تێك دەچێ و بگرە کۆمەڵگە بەرەو فەساد دەڕوات[1].

لەبەر ئەوە ئیسلام رێزگرتنی کەسایەتی مرۆڤ و ژیان و ماف و ئازادی و ئەمن و ئاسایشی بە زۆر دەزانێ و، لەو پێناوەش هەموو کارو کردەیەك حەرام دەکات، کە ببێتە مایەی تێکچوونی باری ئەمنی و ئارامی، هۆشداری توندیش بۆ ئەوانە دەردەکا، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبنە هۆکاری شڵەژانی ئاسایشی خەڵك و خاکەوە.

هەر کەسێك دەسدرێژی بکاتە سەر ئارامی و ئاسایشی خەڵکی، بەر لەهەر شت دەبێ ئەوە بزانێ کە فەرمانی خوای گەورەی شکاندووە و تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە، وە دەبێ ئەوەش بزانێ کە ئەو کەسە بە کەسێکی دەرچوو لەژێر سێبەری فەرمانڕەوای موسوڵمانان دادەنرێت و، ناوی تێکدەرو رێگرو ستەمکارو باغی بەسەر دەچەسپێت، هەر یەك لەمانەش ئایینی ئیسلام توندترین سەرکۆنە و سزای بۆ داناوە، بۆ ئەوەی خەڵك لە دەست و پیلان و تاوانی ئەوانە دوور بخاتەوە.

هەر کەسێك ببێتە هۆکاری تێکچوونی ئەمن و ئاسایشی کۆمەڵگە و بڵاوکردنەوەی کاری تێکدەرانە و پشێوی و تاوان، ئەوە بە پێی ئایەتی قورئانی بەر هەڕەشە دەکەوێت و پێویست دەکا سزا بدرێت، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)[2]، واتە: بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەجەنگێن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاو

---

[1] - تفسير آيات الأحكام: ب/١ ل/٣٩٨
[2] - المائدة: ٣٣

کردنەوەی فەسادو بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووەو جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەوسزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لەدنیادا، لەقیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆ هەیە.

راڤەکارانی قورئان لە بارەی وشەی (المحارب)وە دەڵێن: کەسێکە کە ترس بخاتە ناو خەڵکەوە، یان بەمانای ئەوە دێت کەسێك ستەم لە خەڵك بکا، یان ئاشوب بڵاو بکاتەوەو ئاشتی بشێوێنێ، یان لەرووی ماددیەوە زیان لە خەڵك بدا[1].

لە ئیسلامدا دروست نیە مرۆڤ لە حاڵەتی ئاسایی و بە شێوەی سوعبەتیش کەس بترسێنێ، چ جای ئەوەی بەراستی دۆخی ئەمنی تێك بداو ترس و بیم بخاتە ناو خەڵکەوە، نمونەی ئەو راستیە زۆر راشکاوانە لە نێو فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) باسی لێوە کراوە.

نوعمانی کوڕی بەشیر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دابووین، پیاوێك لەسەر وڵاخەکەی خەوی لێ کەوت، هاوڕێیەکی تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا، واتە بە گاڵتەو سوعبەت ویستی بیترسێنێ، پیاوەکە لەخەو هەڵساو راچڵەکاو ترسا، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەم حاڵەتەی بینی و فەرمووی: (**لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا**[2])، واتە: بۆ هیچ موسڵمانێك نیە، موسڵمانێکی تر بترسێنێ.

کەواتە بەپێی ئەو فەرموودەو ئەو حاڵەتە سادەو سوعبەتیە، ئەگەر ترسان و تێکدانی ئارامی کەسێك حەرام بێت، دەبێ ئەو هەڵوێستە بەرامبەر کەسێك کە ژیان و کیان و کۆمەڵگە بخاتە مەترسیەوەو ئاسایشی بشێوێنێ چەندە حەرام و گوناهو ستەم و تاوان تر بێ !؟

---

[1]- تفسير آيات الأحكام: ب/١ ل/٣٩٠-٣٩٤
[2]- سنن أبي داود: ب٤/ ل/٣٠١

کەواتە لە ئیسلامدا پاراستنی ئەمن و ئاسایش نەك تەنها باسکردنێکی سادەیە، بەڵکو ئەرکێکی هەرە گرنگ و گەورەو پێویستە، دروست نیە بەهیچ جۆرێ تێك بدرێ یان بخرێتە بەر مەترسیەوە، چونکە ئەگەر ئارامی و ئاسایش کەوتە مەترسی و شڵەژا، تێکڕای جومگەکانی ژیان دەکەوێتە ناهەموارییەوە، وە لەڕووی دەروونی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە مرۆڤ دەکەوێتە دۆخێکی نالەبارەوە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بۆ هیچ کەس و لایەنێك، دۆخی ئەمنی بشێوێنێ، یان کارێك بکا مەترسی بۆ سەر لایەنی ئەمنی لێ بکەوێتەوە.

***

## سەرەتا..

ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە بایەخەوە لە مزگەوت دەڕوانێ‌و پیرۆزی‌و تایبەتمەندیشی داوەتێ، مزگەوتی دیاری کردووە بۆ خواپەرستی‌و وەرگرتنی پەیام‌و شیکاری پرسە هەستیارو گرنگ‌و شەرعیەکان، وە بە شوێنی کۆبوونەوەی ئینسانی‌و ئیمانی وەسفی کردووە، بۆیە لە قورئان‌و فەرمودە باس کراوەو لەزۆر لایشەوە تیشك خراوەتەوە سەر رۆڵ‌و پێگەی مزگەوت لە ناو کۆمەڵگەدا، چونکە ئامانج‌و گرنگی زۆری لەخۆ گرتووە، یەکێ لە مەهام‌و پەیامەکانی مزگەوت دروستکردنی کەشێکی ئارام‌و بلاوکردنەوەی هۆشیاریە لەمەڕ پاراستنی ئەمنیەت‌و بەقەرار کردنی ئاشتی کۆمەڵایەتی‌و ئاسایشی نیشتمانەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) مزگەوت بە تەنها نوێژو خواپەرستی تێدا نەکراوە، بەڵکو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەمزگەوت پێشوازی لە شاندو نوێنەری لایەنەکان کردووە، لەوێوە بڕیاری دەرکردنی شاندی داوە، ئەڵقەی زیکرو زانستی تێ بەستووە، کۆبوونەوەی نێوخۆیی تێدا ئەنجام داوە، پرسی دەعوەو ئاشتی‌و راوێژو سوڵح‌و چاکسازی تاوتوێ کردووە، بە کورتیەکەی هەرچیەك لە بەرژەوەندی کاروباری موسڵمانانەوە بێ‌و پرسێکی دینی‌و دونیایی گرنگ بوایە لەمزگەوت باسی لێوە کراوە.

لەبەر ئەو رۆڵە گرنگە پێم باشە لەچەند باسێکەوە بچینە سەر چەند خاڵێکی گرنگ، کە پەیوەستن بە ناوەرۆکی ئەو پرسەو مەسەلەی ئەمن‌و ئاسایشەوە:

# باسی یەکەم
# پێگەو پەیامی مزگەوت

مزگەوت ماڵی خوایە لەسەر زەوی و شوێنی خواپەرستی و بەیەکگەیشتنی موسڵمانان و کۆبونەوەو جێبەجێ کردنی دروشمە ئاینییەکان و نوێژی بەکۆمەڵ و تاوتوێ کردنی پرسە گرنگەکانی ئۆمەت و موسڵمانان[1].

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا)[2]، واتە: دڵنیا بن کە مزگەوتەکان تایبەتی خوای گەورەن، دەبێت هەر ئەوی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.

هەروەها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ أَسْوَاقُهَا)[3]، واتە: خۆشەویستترین شوێن لەسەر زەوی بەلای خوای گەورەوە مزگەوتەکانە، وە ناخۆشترین شوێنیش بازارەکانە.

مزگەوت شوێنی دروستکردن و پێگەیاندنی مرۆڤەو پەیمانگایەکی بەهێزە بۆ بینا کردنی کۆمەڵگە، وەك چۆن ئەگەر کەسێك بیەوێ کۆشکێك بکات، لە بناغەوە دەست پێ دەکاو خشت خشت دەیخاتە سەر یەك تا سەرەنجام کۆشکێکی جوانی لێ بەرهەم دێ، بەهەمان شێوە مزگەوتیش یەك یەك ئیمانداران پەروەردە دەکا، بە شێوەیەك سەرەنجام پێکەوە ببنە یەك

---

[1] - أصول الإيمان والإسلام: ل/٣٩٤
[2] - الجن: ١٨
[3] - صحيح مسلم: ب/١ ل/٤٦٤

جەستەو پێکەوە کۆمەڵگە پێك بێنن، دواجار لـەرێی عەقیـدەو عیبـادەتو مەنهەجیشـەوە، بتوانن سیمای دینداری خۆیان رێك خەنو هەیکەلی کۆمەڵگەش یەکخەن[1].

لە ئایینی پیرۆزی ئیسـلامدا مزگـەوت پێگەیـەکی سـەنگینو گـرنگو کـارای هەیـە، وە رۆڵێکی بەرچاوی لە ژیانی ئوممەتدا هەبووە، ناوەندێکی بەهێزی رۆحیـە بـۆ مومارەسـەکردنی دروشمە ئایینیەکانو ئەنجامدانی خواپەرستیەکان، بنکەیەکی سەرەکیە لە ئاراستە کردنی تـاكو کۆمەڵ لەمەڕ دروستبوونی هۆشـیاریو شـارەزایی پێویسـت، سـەبارەت بـە بنـەماو پـەیامو رێنماییو سیستەمو تێگەیاندنو پێگەیاندنەوە، شوێنێکی کاراو کاریگەریشـە لـە پتـەوکردنی برایەتیو یەکڕیزیو بنەما کۆمەڵایەتیەکان لە لایەكو، رێکخستنی گوفتـارو رەفتـارو کـردارو هەڵسوکەوتو رێکخستنی پەیوەندیەکان لەلایەکی ترەوە.

مزگەوت زانکۆیەکی دانەبڕاو و هەمیشەیی نێو کۆمەڵگەیـەو، تێیـدا زانسـتو زانیـاریو هۆشیاری لەبارەی خواناسیو دینداریو مەنهەجو شەریعەتو فکرو سلووكو تەزکیـەو مـافو رێزو بەهاو ژینگەو ژیارو پێشـکەوتنو ئیـدارەو حـوکمو یاسـاو دادگـاو دادوەری پـەرە پـێ دەدرێو بڵاو دەکرێـتەوە.

مزگەوت شوێنی بە یـەك گەشـتنو راسـپاردەو راپرسـیو رامـانو راهێنـانو توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوەو بڵاوکردنـی گیـانی تـەباییو خۆشەویسـتیو یەکسـانیو دادپـەروەریو یـەك هەڵوێستیو دیالۆكو شوراو چارەسەرکردنی پرسو پێشهاتەکانە.

مزگەوت بەردەوام پـەیامێکی دەسـتووری بـۆ رۆڵـەو نـەوەی نـوێ پێیـە، وەك وانەیـەکی پەروەردەیی وا دەکا مرۆڤ لە هەڵچوونو رووچونو زیـادەرۆییو سـەرەڕۆییو لادانو مەترسـیو رقو کینەو تاوانو سەرپێچیەکان خۆی بپارێزێو، دەروونی خۆی لەسەر پاکیو چاکیو راستیو رێکیو جوانیو تەباییو دڵنیاییو ئارامی رابێنێت.

[1] - فقه السيرة النبوية للنابلسي: ل/٥٧

ئیسلام لە رێی مزگەوتەوە دەیەوێ ژیانی کۆمەڵایەتی موسڵمانان لە رەوشێکی باش گوزەر بکا، پێکەوە هەڵکردن و یەکتر قەبوڵکردن و تەواوکاری هەبێ و، رۆژ بەرۆژ بەرەو پێشەوە بروات، سەدای ئیمان و زەنگی دەنگی منارەکان و پەیامی نێو وشەکانی بانگ گەیاندنی ئەمان و ئەمنە بە بازنەی کۆمەڵایەتی و ئاراستەکردنی کۆمەڵگەیە لەژێر سەدای پەیامی ئەو ئایینە پیرۆزەی خوای گەورە وەك رەحمەتێك بۆ تێکرای مرۆڤایەتی ناردووە.

ئیسلام زۆر بە گرنگەوە لە مزگەوت دەڕوانێ و پێگەکەی بەرز رادەگرێ و جۆرێك لە قودسیەتی داوەتێ، هەر بۆیەش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دوای گەیشتنی بە شاری مەدینە، یەکێ لەو سێ کارە هەرە گرنگ و مێژووییانەی ئەنجامی دا، بریتی بوو لە دروستکردنی مزگەوت[1]، چونکە دەرکی ئەو راستیەی کردووە کە مزگەوت کۆڵەگەیەکی گرنگی کۆمەڵگەیە و، تێیدا برایەتی و دادپەروەری و یەکسانی و یەکریزی و تەبایی و ئاشتی و ئارامی بڵاودەکرێتەوە، ئامانجیش لە ئەنجامدانی خواپەرستیەکان لە مزگەوت بۆ ئەوەیە مرۆڤ رابێ لەسەر کاری دەستە جەمعی و گیانی هاوکاری و هەستی ئینتیما بۆ دین و دونیا، کیان و کۆمەڵگە، خەڵك و خاك.

مزگەوت خاڵی دەسپێکی کۆمەڵگەیەکی لەبارو گونجاوە، کانگای شارستانیەتی ئیسلامیەو، لەوێوە نووری ئیرشاد و ئیمان و ئامۆژگاری و هیدایەت و رێگەی سەرفرازی دونیا و دوا رۆژ سەرهەڵدەداو رێچکە دەگرێ.

مزگەوت بانگەشەی ئیمان و ئەمن و دەستەبەری ژیانێکی خۆش و باش بۆ تاکەکانی نێو کۆمەڵگە دەکاو ئارامی دەروونی بڵاو دەکاتەوە، بەوەی کە مرۆڤ لەسەر تەوەکول و رازی بوون بە بەشی ژیان و ئارامگرتن و خۆپارێزی لە دیاردە خراپەکان رادێنێ.

[1] ـ فقه السيرة: ل/١٥٢

مزگەوت سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ئەمن و ئەمان، چونکە مرۆڤ بەرەو ئیمان و هیدایەت دەبات و، هەستی ئۆقرەیی و ئارامی دەروونی دەبەخشێت و نێوان تاکەکان پتەو و تەباو ئاشت دەکا، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە لە کەشێکی سەقامگیرو ئەمین خۆی ببینێتەوە.

بۆیە دەکرێ بڵێین: پەیامی مزگەوت پەیامێکی گشتگیرو گشتی و هەمەجۆرە، لەچوارچێوەی گەیاندنی بەها ئایینی و ئەخلاقیەکان و ئاداب و سیماو دروشم و چەمکە ئیمانیەکانەوە، بایەخ بە گشت لایەنەکانی ژیان و کۆمەڵگە دەدات و، تیشکی پەیامەکەی چڕ دەبێتەو بۆ دروستکردنی ئەمنیەت لەناخی تاك و کۆمەڵگەو کیانەوە.

کاتێ تاك پەیوەست دەبێ بە مزگەوت و خۆی لەسەر پەیامە گرنگەکانی رادێنێ، کاریگەری و رەنگدانەوەی زۆرو ئەرێنی لەسەر کۆمەڵگە دەنێتەوە، چونکە ئیسلاح بوونی تاك و جێبەجێ کردنی دروشمە ئاینیەکان، وا دەکا ئەو تاکە هەست بە ئارامی دەروونی بکا، کە بەهۆی پابەندی و لەبەرچاوگرتنی ماف و زیکری خواو خۆ ئیسلاح کردن دروست دەبێ، ئەوەش سەرەتاو بناغەی کۆمەڵگەیەکی ئارام و هێمنە.

کەواتە مزگەوت پێگەیەکی زۆر گرنگی هەیە لە روانگەی ئیسلام و واقعی حاڵی گەلانی موسڵمان بە تێکڕا، وە پەیامێکی زۆر گرنگتری لەخۆ گرتووە، کە خۆی لە تەبایی و ئاشتی و بەرقەرارکردنی ئەمن و ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان دەبینێتەوەو بەختەوەری بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

❊❊❊

# باسی دووەم
# نوێژی بەکۆمەڵ و پەیامی ئاشتی و ئارامی

نوێژکردن یەکێکە لە فەرزەکانی ئیسلام، فەزڵ و گەورەیی و تایبەتمەندی زۆرو هەمە لایەنەی هەیە، پەیام و حیکمەت و سوودو بەهرەو دەرهاوێشتەکانی نوێژ یەکجار زۆرو فراوانن، بۆیە ئیسلام دەیەوێ مرۆڤ بەتەنها جێبەجێ کردنی ئەو فەرزەی لا مەبەست نەبێ، بەڵکو پێویستە حیکمەت و دەلالەتی نوێژ بزانێ و کاریگەری بەسەر دەروونی نوێژ خوێن و جەستەی کۆمەڵگەوە دەرکەوێت، چونکە لە فەرهەنگی ئیسلامدا نوێژ دەورێکی سەرەکی هەیە لە دروستکردن و ئاراستەکردنی تاکدا، ئەمەش هۆکارە بۆ کەمکردنەوەی تاوان و سەرپێچی و پاراستنی عەقیدەو رەوشی دینداری موسڵمانان لە لادان و هێز و بیرو سیستەمە چەوت و ترسناکەکان.

لەگەڵ ئەوەی نوێژ بەجێگەیاندنی فەرمانی خوایە، لەهەمان کات قوتابخانەیە، پاکبوونەوەیە، خۆپاراستنە، پێشکەوتنە، رەوشت و بەهایە، چاکەیە، رێکخستنی ژیانە، پەروەردەیە، تەزکیەیە، تەندروستیە، راهێنانە، بەرپرسیارێتیە، هەستی چاودێریە، پابەندیە، نزیکبوونەوەیە، رێکخستنی پەیوەندیەکانە[1].

لە مزگەوت مرۆڤ دەتوانێ پەیوەندی نێوان خۆی و خوا، خۆی و خەڵك، لە رێی نوێژی بەکۆمەڵەوە بەجوانی رێك بخا، نوێژ کە خواپەرستیەکی تایبەت و جەستەییە و کۆمەڵێك زیکرو نزای هەڵگرتووە، وە ئەنجامدانی بە کۆمەڵ کە فەزڵێکی زۆرو حیکمەتی هەمەچەشنەی لەخۆ گرتووە، هۆکارێکی گرنگە بۆ هێنانی ئارامی دەروونی و دوورخستنەوەی مرۆڤ لە تاوان و

---

[1] ـ حکم أحکام القرآن: ٣٨

لادانەکان، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: (الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)[1]، واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو دڵو دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئانو پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئانو یادی خواو (پابەندبوون بە ئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبنو دەحەوێنەوە.

هەروا دەفەرموێ: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ)[2]، نوێژ بەچاکی ئەنجام بدە، چونکە بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناهو تاوانو نادروستی دەکات، بێگومان یادی خوا لە هەموو شت گەورەترو بە نرخترە (کە دەبێت لەکاتی نوێژو کاتی تریشدا بیرو هۆشی ئیماندار، دابگرێت)و خوا خۆی زانایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

دەیان فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەیە، باسی فەزڵو گەورەیی چوون بۆ مزگەوتو ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ دەکەن، کە دەکرێ بڵێین حیکمەتی هەرە گەورە لەو هاندانو هەنگاوە بریتیە لە:

**یەکەم:** دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە خوە نادروستەکانو ئەنانیەتو دوورەپەرێزیو یاخیبوونو داخراویو خەمۆکی لەلایەكو، بەهێزبوونی لایەنی کۆمەڵایەتیو هەست کردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر پرسە کۆمەڵایەتیو نیشتمانیەکان لەلایەکی ترەوە، وەك مەولانا جەلالەدینی رۆمی دەڵێت: ئەگەر پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان جێگەی بایەخێکی یەکجار زۆر نەبن لە ئیسلام، ئەوە فەرمانکردن بە ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵو وتاری هەینیو فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە هیچ مانایەکی نەدەبوو[3].

---

[1] - الرعد: ٢٨
[2] - العنكبوت: ٤٥
[3] - رجال الفكر والدعوة: ب/١ ل/٣٣٨

**دووەم:** پتەوکردنی پەیوندی نێوان تاك و خزم و دراوسێ و دۆست و ئاسیاوەکانە، کە بەهۆیەوە مرۆڤی موسڵمان ئەگەر رۆژێ یەکجاریش بێ هەواڵیان دەپرسێ و دەزانێ لەچ کاروباردان، وە هەبوونی پەیوەندیەکی تۆکمە لەنێوان هامۆشۆکارانی مزگەوت دروست دەکا، هۆیەکە بۆ درز تێ نەکەوتنی راڵەیەی برایەتی، فاکتەرێکی گرنگە لە سەقامگیری کۆمەڵایەتیەوە.

**سێیەم:** خۆراهێنان لەسەر چەمك و بەها باڵاکانی وەك ئاشی و گیانی هاوکاری و یەکسانی و تەبایی و خێرو چاکەو کاری مرۆیی و گەیشتن بە ترۆپکی ئەو رەوشتە بەرزانەی قورئان داوا دەکا پابەند بین پێیانەوە.

**چوارەم:** پەیامێکە بۆ ئەوەی هەمیشە مرۆڤ ئاستی باشترین هەڵبژێری و خۆیشی لە کاروان دانەبڕێ، ئەوەش لە فەرمودەی پێغەمبەر( درودی خوای لەسەر بێت) خۆی دەبینێتەوە، کاتێ ئاماژە بە فەزڵ و گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ دەکا و بە بیست و حەوت پلە پاداشت جیای دەکاتەوە لەگەڵ ئەو نوێژەی مرۆڤ بەتەنها ئەنجامی دەدات.

**پێنجەم:** وەك چۆن لە مزگەوت پابەندی هەیە لە بارەی رەخساندنی زەمینەی دادگەری و یەکسانی و برایەتی و نەبوونی رق و کینەو توندو تیژی، بەهەمان شێوە ئامانج لەو نوێژە بە کۆمەڵە ئەوەیە لەدەرەوەی مزگەوتیش مرۆڤ لەسەر هەمان رێڕەو رابێت و بە کردەیی پەیڕەویان بکات، چونکە ئەوانە وەك پێشتر باسمان کرد فاکتەرن بۆ دەستەبەربوونی ئەمن و ئارامی کیان و کۆمەڵگە.

لێرەوە ئەو کاریگەریە جوانەی مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ دەردەکەوێ، کە ئامانجیەتی بنچینەکانی دەستەبەر بوونی ئەمن و ئارامی مرۆڤ و کۆمەڵگە لە هزری تاك بچەسپێنێت و، ئۆقرەیی و ئاسایش لەناو خەڵك بڵاو بکاتەوە.

# باسی سێیەم
# وتاری هەینی و بەرپرسیارێتی ئەمنی

وتاری هەینی بە یەکێ لە فەرزەکانی سەر ئوممەتی ئیسلام دادەندرێت، کـە ئەرکـە لەسـەر موسڵمانان پێوەی پابەنـد بـن و سـوودو کـەڵك و ئامۆژگـاری و بینچـینەو بنـەماو تەعالیمـە جوانەکانی ئیسلامی لێوە فێر بن، لەهەموو سەردەمەکان بەتایبـەت لـە هـەژموونی چـواردە سەدەی مێژووی موسڵمانان ئەوە سەلماوە، کە ئەو وتارە بە یـەکێ لـە کاریگـەرترین سەرچـاوە دێت بۆ بانگەشەی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری ئایینی و پەروەردەکردنی تاکـەکان و بـەرەو پێش بردنی گوتاری ئیسـلامی لـە چوارچـێوەی خیتـابێکی گشـتگیرو مـەنتیقی و بـە لەبـەر چاوگرتنی بەرژەوەندی ژیارو ژینگەو مرۆڤایەتی و بەرژەوەندیە باڵاکانەوە، بۆیە دەبینی لەسـەر ئەرزی واقع وتاری هەینی ئامادەییەکی بەرچاو و رۆڵێکی کاراو دەورێکـی کاریگـەری لەسـەر کۆمەڵگەو ژیانی رۆحی و فەرهەنگی و فکری و کۆمەڵایەتی و سیاسـی و ئـەخلاقی هەیـە، هـیچ دەزگاو ناوەندێك نیەو نابینی هێندەی مزگەوت خەڵك بەدەوری کۆببنەوەو بەو پەڕی ئەدەبـەوە ئیلتیزام بنوێنن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هێمای بۆ ئەوە کردووە، کە کۆبوونـەوەو بەدەمەوەچـوونی وتاری هەینی یەکێکە لەو هۆیانە دەبێتە مایەی خێر بۆ ئۆممەت و تێکڕای جومگـەکانی ژیـان بەتایبەت لەرووی وەرگرتنی زانیاری و خۆپێگەیاندن و بیرخستنەوەو فێربوونەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ)[1]، واتە: ئەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە

---

[1] - الجمعة: ٩

کاتێ کە بانگ درا بۆ نوێژ لە رۆژی هەینیدا، ئێوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوەو، واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، چونکە ئەو کارەتان چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێ بگەن.

بە وردبوونەوە لە ناوەرۆکی ئەو فەرزە، دەگەینە ئەو راستیە، کە وتاری هەینی لەگەڵ ئەوەی کۆبوونەوەیەکی فەرمان پێکراوەو، لەسەر ئاستی هەفتانە لەناو مزگەوت موسڵمانان بە مەبەستی بەجێگەیاندنی ئەو فەرزەو تاوتوێ کردنی پرس و بابەتی گرنگ و هاوچەرخ کۆدەبنەوەو گوێ بۆ ئامۆژگاریەکان شل دەکەن، دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو وتارە بێ حیکمەت نیەو بگرە پەیامێکی هەرە زیندو و نزیکی نێو کۆمەڵگەیە، کە کۆمەڵێك ئامانجی هەیەو لەپەنای ئەو ئامانجانەش مەبەستیەتی پەرە بەلایەنی سەلامەتی کیان و ئەمنیەتی هاوڵاتیانەوە بدات.

چونکە وتاری هەینی دەیەوێ پەیامی ئیسلام بە هەموو بەشەکانیەوە بە مرۆڤایەتی بگەیەنێ، دەیەوێ هەرچی لەپێناو بەرژەوەندی دین و دونیای بەندەکان بێت روون بکرێتەوە، دەیەوێ هەمیشە مرۆڤ لەسەر چاکی و جوانی و بەهاو رەوشتە بەرزەکان رابێنێ و دووری خاتەوە لە خراپی و ناشیرنی و بێ نرخی و دیاردە نادروستەکانەوە، دەیەوێ تاك و خێزان لەسەر بنەمایەکی ئینسانی و پەروەردەیەکی مرۆیی و پەیوەندیەکی دۆستانە ئاراستە بکات، دەیەوێ کار بکات بۆ کرانەوەی عەقڵ و بەرەو پێشبردنی فکرو بەختەوەربوونی دەروون و ئیسلاحبوونی کارو هەنگاوەکان، دەیەوێ بیری زانستی و رۆشنفکری و رامان و قوڵبوونەوەی مەعریفی و لێکدانەوەی ئیجابی و وەرگرتنی زانیاری و داهێنان و نوێخوازی بەرهەم بێنێت، دەیەوێ حەقیقەتی ئیسلام وەك خۆیی و حوکمە شەرعیەکان لەسەر بنەمای زانستی کە پێشینان چوارچێوەیان بۆ دارشتووە بگەیەنێت، دەیەوێ پەیامی برایەتی و گیانی هاوکاری و کاری چاکەو گرتنەبەری رێگەی سەرفرازی نیشان بدات، دەیەوێ لەکاتی پێویست هەڵوێستی شایستەی هەبێ و رێگە بگرێت لەهەر ئەگەرو هەنگاوێك، کە سوکایەتی بۆ هەست و نەستی دیندارانە تێدا بێت، دەیەوێ خەڵك بەرەو هیدایەت و خواپەرستی و سەربەستی و خۆشەویستی و یەکریزی و

هاوخەمی و بەرێت، دەیەوێ مژدەی خۆشی و کامەرانی بەوانە ببەخشێت کە بەتامەزرۆوە پابەندی جوان و رێك نیشان دەدەن و هۆشداریش بداتە ئەوانەی خۆیان سەرگەردان دەکەن و لەباوەشی رەسەنی ئیسلام جێگەی خۆیان وەك پێویست ناکەنەوە، دەیەوێ رێزو کەرامەت و دادپەروەری و یەکسانی و پاراستنی ماف و ئازادیەکان وەك بەشێکی دانەبڕاوی نێو کۆمەڵگە و پێویستیەکی حەتمی ژیان بناسێنێ، دەیەوێ هەستی ئینتیما بۆ خاك و خەڵك و نیشتمان دروست بکاو هەر کەس ولات و ژینگەو نیشتمانی خۆی خۆش بوێ و پارێزگاری لێ بکات..هتد.

لەبەر هەموو ئەوانە دەکرێ بڵێین وتاری هەینی رۆڵێکی یەکجار گرنگ و گەورەی هەیە لە ناو موسڵمانان و کۆمەڵگەدا، چونکە بەردەوام جەخت لەو هۆیانە دەکرێتەوە کە زامنی دروستکردنی ئەمن و ئارامین، بە بەردەوامیش ئەو رێکارانە دەوروژێندرێن کە زامنی پاراستنی ئەو پرسەن، لەگەڵ ئەوەش لە کوردستاندا بە شاهێدی دۆست و دوژمن رۆڵی مینبەر لەبەرقەرارکردنی ئەمن و ئاسایش و هۆشیارکردنەوەی هاولاتیان و باسکردنی مەسەلەی ئەمن و پارێزگاری لێکردنی لە ئاستێکی باش و بەرچاو دایە، بەڵام چۆن وادەبێ ئەو وتارە کاریگەری پتر دروست بکا لە بارەی هۆشیاری موسڵمان بۆ پاراستنی ئەمنیەت و پارێزگاری نیشتمانەوە!؟

ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خودی وتاربێژان و ئاستی خوێندنەوەو لێکدانەوەیان بۆ کۆی ئەو دەقانەی باس لە بایەخی ئەمن و ئاسایش دەکەن، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەستە ئایینی و نەتەوەییەی، بەرژەوەندی ئیمانی و ئینسانی و نیشتمانی لەبەر چاو دەگرێت، هەمیشە لە رێی پەیوەستکردنیان بە یەکترەوە تێڕوانینی ئیجابی لەمەڕ پرسەکە شۆڕی نێو کۆمەڵگە دەکاتەوە.

راستیەکە ئەوەیە مەسەلەی ئەمن و ئارامی نیعمەتی خوایە، وە لە چەندین ئایەت و فەرموودە باس لە گەورەیی ئەو نیعمەتەو کاریگەری و دەرهاوێشتەکانی کراوە، لەگەڵ ئەوەش ئیسلام مەسەلەی پاراستنی ئاسایشی خەڵك و ولات بە بەشێك لە دینداری تاك دیاری کردووە، وە لەواقعی حاڵدا هیچ دینداری و دونیا ویستیەك بێ بوونی قەوارەی ئەمنی سەر ناگرێت، لەو

پێنـاوەش شـەریعەتی ئیسـلام کۆمـەڵێك رێنمـایی‌و رێکـارو هۆکـاری دیـاریکردووە بـۆ دەستەبەربوون‌و پاراستن‌و سەقامگیری‌و بەقەراربوونی پرسی ئاسایشی گەل‌و وڵات.

خۆشـبەختانە وتـاری هـەینی‌و منیبـەری مزگەوتـەکان دەورێکـی ئیجـابی دەگێـڕن لـە دەستەبەرکردنی ئەمن‌و کۆمەڵگەیەکی ئارامەوە، بۆ ئەوەش هەوڵدراوە تاك بەجوانی پـەروەردە بکرێ لەرێی بەهێزکردنی سلوك‌و پەرەدان بە دادپەروەری کۆمەڵایـەتی‌و گیـانی هەماهـەنگی‌و تـەبایی‌و دیـاریکردنی مـاف لەلایـەك‌و، دوورخسـتنەوەی دووبـەرەکی‌و یـەکتر بوغزانـدن‌و دوفاقیەت‌و ئەنانیـەت‌و نـاکۆکی‌و کێشـەو ئاشـووب لەلایـەکی تـرەوە، ئـەوەش وای کـردووە هەمیشە ئەو رێڕەوە وەك هەستێکی زیندوو لەناو ئەو پەیام‌و وتـارە حـوزووری هـەبێ‌و بەسـەر جەستەی کۆمەڵگە رەنگدانەوە دروست بکا.

کەواتە ئەو ئەهج‌و گوتارە وەك چۆن رۆڵی دیارو بەرچاوە لە ئێستادا، بەهەمان شێوە دەبـێ زیاتر رەنگدانەوەی هەبێ‌و بکرێتە بەشێکی هەمیشەیی لە کۆی پەیامی مینبەرو مزگەوتـەوە، تا دواجار هۆشیاری پێویست‌و پەیوەست بەو پرسە بە هاوڵاتیان بگات‌و بەرچاویان روون بێـت، بۆ ئەوەی وەك تاك هەست بە بەرپرسیارێتی خۆیان بکەن‌و وەك لایـەنێکی ئیمـانی‌و ئـەرکێکی ئایینی لێی بڕوانن.

* * *

# باسی چوارەم
# پێگەو رۆڵی زانایانی ئایینی و پرسی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی

## برگەی یەکەم: پێگەی زانایانی ئایینی لە ئیسلامدا

زانایانی ئایینی لە تێروانینی ئیسلامدا تایبەتمەندی و رێزو بەهای خۆی هەیەو، بگرە لەچەندین ئایەت و فەرمووده، باس لە فەزڵ و پێگەو پیشەو پاداشتیان کراوە، چونکە ئەوان میراتگری پێغەمبەرانن و پەیامی خوا بە خەڵك دەگەیەنن، لەهەمان کات زانست و زانیاری بلاو دەکەنەوەو بەهۆیەوە خەڵك بەرەو خواناسی و دینداری و پابەندی بانگ دەکەن، بەردەوامیش بانگەشەی کاری ئینسانی و چاکەو خێرو خۆشی و موژدەبەخش بەگوێی مرۆڤایەتی دەکەن، بۆ ئەوەی خەڵك رابێنن لەسەر ئیلتیزامی دینداری و جێبەجێ کردنی بنەماکانی خواپەرستی و دوورکەوتنەوە لەناشەرعیەکان و بەرجەستەکردنی رێنمایی و ئامۆژگاری و بەها جوان و بالاکانی ئیسلام، کە خۆی لە ئەخلاقیات دەبینێتەوە.

لەبەر ئەوە خوای گەورە پلەی ئەوانەی بەرز نرخاندووە، کە لەناو پەرێزی ئیمان و سێبەری ئیسلامەتیدا رێگەی زانست هەڵدەبژێرن و بانگەوازی بۆ دینی خوا دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾[1]، واتە: خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوەو ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە، چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە، خوایش ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

---

[1] ـ المجادلة: ١١

هەروەها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (العُلَماءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا ولا دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ)[1]، واتە: زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە دیارە پێغەمبەران زێڕو زیویان بەمیرات جێنەهێشتووە، بەڵکو زانستیان کردۆتە میرات، جا هەر کەسێك ئەو میراتی زانستە وەربگرێ، ئەوە بێگومان پشكو بەشێکی باش‌و چاکی پێ براوە.

ئەو فەرمودەیە ئاماژەیە بە تایبەتمەندی پێگەی زانایان‌و گەورەیی زانست، چونکە کەسی زانا هەمیشە بە تێڕوانینی زانستی‌و پێوەری دینداری لەشتەکان دەڕوانێ، وە وەکو کەسێکی سادەو نەزان نیە بنەمای زانستی بۆ شتەکان نەبێت، چونکە جیاوازی لەنێوان کەسی زاناو نەزان یەکجار زۆرە، خوای گەورەش ئاماژەی بەوە کردووەو دەفەرموێ: (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ)[2]، واتە: ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن‌و شارەزان، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن‌و شارەزاییان نیە؟، بەڕاستی تەنها خاوەن بیروهۆشەکان لەم جۆرە یاداوەریانە سوود وەردەگرن‌و تێدەگەن.

کەواتە ئیسلام لە دیدێکی تایبەتەوە لەشارەزایانی شەریعەت دەڕوانێ‌و، چەندین تایبەتمەندی دینی‌و دونیایی‌و دوارۆژ بەوانەوە دەبەستێتەوە، چونکە زۆرێك ئایەت‌و فەرموودەی تر هەیە باس لە گەورەیی زانست‌و پێگەی زانایان دەکەن، لێرەوە دەرفەتی باسکردنیان کەمە.

***

[1] - سنن أبي داود: ب/٣ ل/٣١٧
[2] - الزمر: ٩

## بڕگەی دووەم: رۆڵی زانایانی ئایینی لە سەقامگیری ئەمنیدا

لە سۆنگەی ئەو بایەخدانەی ئیسلام بە پێشەوایانی ئوممەت، دەبینین زانایانی ئایینی هەمیشەی جێگەی رێزن لەناو خەڵکو، خاوەنی بەهێزترین پێگەی کۆمەڵایەتینو، بگرە هەر ئەوانیش یەکەم کەسن کە لەرێی مینبەرەوە پەیامی خواو رێبازی شەریعەتو دینداری بڵاو دەکەنەوە.

زانایانی ئایینی توێژێکی کاریگەرن لەناو کۆمەڵگەو، ئەوان رۆڵی سەرەکی دەبینن لە دارشتنی شێوەی بیرکردنەوەو هەستو ویژدانو ئاراستەی شەقامی کوردستاندا، ئەوان بەحوکمی ئەو مەوقیعە رۆحیەی هەیانە پێشەنگو چاولێکراو و دەمراستی میللەتن.

رۆڵو کاریگەری زانایانی ئایینی وای کردووە، هەمیشە بە قازانجو لایەنێکی هاوکارو پڕ خێر بۆ کوردو کوردستان تەواو بێت، چونکە پەرێزو پاشخانو پیشەو کارو هەنگاو و کۆششیان لەپێناو خەمی خاکو خەڵکو هێمنیو ئارامیو سەقامگیری کۆمەڵگە تەرخان کردووەو دەکەن، ئەوەش لەچەند رووێکەوە دەردەکەوێت:

### أ_ لەرووی مێژووییەوە:

مامۆستایانی ئایینی پێگەو رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە قۆناغەکانی مێژووی گەلی کورد بە هەردوو تەمەنی دێرینو ئێستایشەوە، لەو نێوەشدا زانایانی ئایینی خاوەن پەرێزێکی پاکو شکۆمەندیەکی مەزنو مێژوێکی پڕ دەسکەوتو سەروەرین، وە لەسەر ئاستی بوارەکانی رۆحیو دینداری، ئەخلاقی، پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، هۆشیاری، فەرهەنگی ...هتد، جوهدو رەنجی زۆریان کێشاوەو لەوەشدا کورد قازانجو دەسکەوتی گەورەی لەو

کۆششەی زانایانی ئایینی دەست کەوتووەو سەدانو هەزان سەرچاوەو کتابو بەرهەمی بۆ بە میرات ماوەتەوە.

لەلایەکی ترەوە هەر کەس بیەوێ چاو بە مێژووی نەتەوەیی کورد بخشێنێتەوە، ئەو راستیەی بۆ دەسەلمێ، کە زانایانی ئایینی لە هەموو قۆناغەکان حوزورێکی کاراو بالآیان هەبووەو هیچ کات بەدەر نەبووە لە کێشەو پێشهاتی نەتەوەی خۆیانو، بگرە بەردەوامیش بەشێك بوونە لە چارەسەرو گەیشتن بە کەناری ئارامی، بەڵگەی زیندووش لەسەر ئەو راستەیە ئەوەیە، کە لە لایەکەوە زۆربەی سەرکردەو شۆڕشگێرو نەتەوەپەروەرو ئەدیبو رۆشنبیرو بیریارو بلیمەتە دیارو هەڵکەوتووەکانی کورد مەلاو زانای ئایینی بوونە، لە لایەکی تریش ئەگەر مێژووی زانایانی ئایینی لە مێژووی کورد جیابکەینەوە شتێکی ئەوتۆی لێ نامێنێتەوە.

## ب_ لەرووی ئینتیماو بیری نەتەوەییەوە:

زانایانی ئایینی بەپێی لێهاتوویی و ئاستی هۆشیاری و بەرچاوکراوی و پێشەنگیانو لەچوارچێوەی بنەماو رێنمایی ئیسلامدا، بەردەوام ئینتیمای نیشتمانیان هەبووەو کاریشیان بۆ کردووە، حزوری بەردەوامیان بۆ بەژداری لە پرسە هەستیارەکانو پێشهاتە نەتەوەیی و پرسە نیشتمانیەکان بەڵگەی ئەو راستیەیە، چونکە پێشەوایانی ئیسلام لەگەڵ ئەداکردنی ئەرکە پیرۆزەکەیان هەوڵی داکۆکیکردنو بەدەستهێنانی مافی رەوای کوردیان داوەو هەمیشە شەیدای ئەوە بوونە، گەلی کورد سەرفراز بێو لەهەموو بوارێك پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێ، بۆ ئەوەش مامۆستایانی ئایینی خەباتی شارو شاخیان هەیەو موشارەکەی فیعلی شۆڕشو کوردایەتی و بەرەی بەرگریکردنیان تێدا بووە، نەك تەنها بە سادە سەیری ئەم پرسەیان کردبێ، بەڵکو هەڵگری بیری کوردایەتی بوونەو قوربانیشیان لەم پێناوە داوەو لەسەریشی رووبەرووی فشارو هەڕەشە بونەتەوەو ئەشکەنجەو ئازاریش دراون.

## ج_ لەرووی پەیام و پیشەییەوە:

زانایـانی ئـایینی بـەردەوام بـەدەربڕینی هەڵوێـستو ئامۆژگـاری و وتـە بـە نـرخ و مەنتیقەکانیان، ئامانجیان بووە پەیامێکی پڕاوپڕ لەئاشتی و یەکڕیزی و پێکەوە ژیـانی برایانـەو بڵاوکرنەوەی دادپەروەری و گیانی لێبوردەیی و بەرقرارکردنی ئەمن و ئاسایش لەو وڵاتە پەرە پێ بدەن، لەبەرانبەریشدا هەوڵیانداوە بیری توندڕۆیی و دووبەرەکی و خۆسەپێنی و زوڵم و هەموو ئەو بەربەستو ناهەمواریانە وەلا بنێن، کە زیانیان بۆ بەرژەوەندی گشتی نەتەوە هەبووە.

ئامانجیان ئەوە بووە، کە ببنە پردی پەیوەندی نێـوان ئیـسلام و نەتـەوەی کـورد بـێ هـیچ مەبەستو ئامانجێکی سیاسی لەلایەك و، پەروەردە کردنی رۆڵـەکانی ئـەم گەلـەش بـە هـزری ئاینپەروەری و نەتەوەپەروەری و تاکێکی هۆشیار لەلایەکی ترەوە، کەهەست بـە بەرپرسـیارێتی نەتەوەیی و پاراستنی دەسکەوتە نیشتیمانیەکان بکات و، وەك کـوردێکی موسـوڵمان لەئاست پێویستو کێشەو مەسەلە هەستیارەکان بێ.

هەمیشە بانگەشەی ئەوەیان کردووە، کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئـاینی ئاشـتی و برایـەتی و یەکسانی و دادپەروەری و میانڕەوی و پێکەوە ژیانی دۆستانەیە، ئاینی پەروەردە کردنـی دەروون و جەستەیە لەسەر دروستترین ڕێباز، کە خزمەت بە دەوروبەر بگەیەنێ، ویستویانە تـاکی کـورد لەسەر بنەمایەکی هۆشیار و رۆشنبیر ڕابێنن و، تووشی بە هەڵـە تێگەیشـتن لـە ئـاین نـەبێت و نەکەوێتە ژێر نیری عاتیفەو توندڕەویەوە.

## د_ لەرووی كۆمەڵایەتیەوە:

بە حوكمی پێگەو كاریگەری پەیامو جموجۆڵی كۆمەڵایەتیەوە، هەمیشە كۆمەڵگە بە چاوی ڕێزەوە لە زانایانی ئایینی روانیوە، ئەوەش زادەی ئەو خەمخۆریو تێكەڵاویو بەدەمەوە چوونو چارەسەری كێشەی خەڵكو برەودان بە تاكو دڵسۆزیەی مەلای كوردە، وای كردووە كاریگەری زانایان لەسەر كۆمەڵگەو دۆخی كۆمەڵایەتی لەئاستێكی بەرزو ڕێژەیەكی باش دابێت، لەلایەكی ترەوە زانایان لەبەر پاكیو پاشخانو ڕێزی زۆریانەوە بوونەتە جێگەی متمانەی هەرە زۆری خەڵك، لەوەشدا زۆر پرسو كێشەی جۆراوجۆریان گەڕاندۆتەوە لای مامۆستای ئایینی بۆ چارەسەركردنو وەرگرتنی ڕێنمایی پێویست لەو بارەوە.

بۆیە دەكرێ بڵێین زانایانی ئایینی لە ناو كۆمەڵگە خزمەتی زۆریان كردووەو، بەردەوامیش خزمەت پێشكەش دەكەن، لە دێرینەوە زانایانی ئایینی فەراغی دادگاییو دادوەریان پڕكردبووەوەو لەرووی ئیسلاحو سولحو چارەسەری كێشەكانو راگرتنی هاوسەنگی كۆمەڵایەتی ئەركو ماندوبوونێكی زۆریان كێشاوە، لە ئێستاشدا بەهەمان شێوە لەرێی ئامۆژگاریو وتارەكانیانەوە بەردەوام قسە لەسەر پرسە كۆمەڵایەتیەكان دەكەنو، بە پیر داخوازی خەڵكەوە دەچنو گوێ بۆ كێشەو گرفتەكانیان رادەگرن، بەردەوامیش تەئكید لە نیعمەتی ئارامی وڵاتو سەقامگیری كۆمەڵایەتی دەكەن، بۆ ئەوەی كۆمەڵگە هۆشیاری پاراستنی ئەمنیەتی بەرەو ئاستی پێویست هەڵكشێ.

## هـ_ لەرووی زانستیو رۆشنبیریەوە

لە رووی زانستیو رۆشنبیریو ئەدەبیەوە بەهەمان شێوە زانایانی ئایینی لە كۆنەوە تا ئێستا لەبواری نووسینو تەدریسو زانستو زانیاریو لێكۆڵینەوەو بڵاوكردنەوەی رۆشنبیریو داهێنانو زمانو ئەدەبو شیعرو هونەری وتارو پەیامو ئامۆژگاری بە لێشاو خزمەتیان

پێشکەش کردووە، سەر قافڵەی کاروانەکە زاناو پیاوی ئایینی بوونەو لە مێژووی کۆن و نوێدا چەندان زاناو رۆشنبیری ئایینی و ئایندۆستی گەورە هەبوونە، کە جێدەستیان لە مێژووی ئایینی و فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی فەرهەنگی کۆمەڵگەی کوردیدا بەر چاوە، لەوانە مەولانای رۆمی و، سەعیدی نورسی و، شێخ سەعیدی پیران و، ئیبراهیمی حەیدەری شێخولئیسلام و، مەلا ئیبنو ئادەم و، مەلا موحەممەدی شارەزووری و، عەلائەددینی سوجادی و، شێخ محمدی خاڵ و، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس... چەندانی تر، وە دەیان شاعیرو ئەدیبی هەڵکەوتووی کورد شیعرو پەخشان و نووسینیان هەیە، جا ئەگەر هەموویان لە بنەڕەتدا مەلاش نەبووبن، ئەوە بە پاشخانێکی ئایینیەوە خزمەتی زۆریان گەیاندووەو ئێستاش جێگەی فەخری ئێمە مانان گەلی کوردن.

## و_ لەرووی ئاشتی و ئاسایش و ئارامیەوە:

مامۆستایانی ئایینی هەمیشە خەمخۆری کوردستان و ئەمن و ئاسایش و ئارامی کۆمەڵگە بوونە، مەسەلەی پاراستنی لایەنی ئەمنی و بوونی ئەو هەستەو سەیرکردنی وەك ئەرك بە بەشێك لە دینداری خۆیان زانیوە، بۆیە بەردەوام ئەو رێنمایی و هۆشیاری و ئامۆژگاریانەیان داوەتە هاوڵاتیان، کە پارێزگاری وڵات و پاراستنی ئەمنیەت بەشێکە لە دین و ئەرکێکە لەسەر شانی هەموانەوە پێویستە بپارێزرێ.

لەلایەکی ترەوە مامۆستایانی ئایینی جەخت لەوە دەکەنەوە، کە مەقاسیدی شەریعە پێویستە پارێزراو بن و کەس دەست بۆ کەسی تر درێژ نەکات و دین و عەقڵ و ژیان و ئابرو و ماڵ و سامانی خەڵك نەکەوێتەوە مەترسیەوە، ئەوە دەڵێن کە دینداری بۆ بەختەوەریە، عیبادەت بۆ رەزامەندی خوا و ئیسلاح بوونە، ئیسلام هاتووە تا ژیان و ماف، ژینگەو مرۆڤ، خێرو خۆشی، ئاشتی و ئاوەدانی بگەیەنێت، بەردەوام باس لە چەمکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و گیانی هاوکاری و سەقامگیری و برایەتی و راوێژو دیالۆك و رێزگرتنی بەرامبەر

دەکەن، کە هۆکاری دەسەبەربوونی ئـەمن و ئاسایشـن، بـەردەوامیش جـەخت دەکەنـەوە، کـە کەسی ئیمانـدار دەبـێ پابەنـدی بنـوێنیێو فـەرمان بەچـاکەو نـەهی لـە خراپـەو گوێڕایـەڵی فـەرمانڕەواو هەسـتی بەرپرسـیارێتیو پێکـەوەژیانو گیـانی مامناوەنـدێتیو لێبـوردەییو هاوسەنگی بکاتـە بەرنامـەی ژیـانی، ئەمـەش ڕێکـارێکی گرنگـە بـۆ پاراسـتنی ئاسایشـی نەتەوەییو بەقەرار کردنی ئاشتی.

تەنانەت لەسەر ئاستی نێودەڵەتیو بە پێی دان پێـدانانی کەسـێکی وەك (پـۆل بریمـەری) حاکمی مەدەنی عیراق لەدوای روخانی رژێمی سەدامەوە، لە کتێبـی خۆیـدا (عـام قضـیتە في العراق) باس لە دۆخی ئەمنی عیراقو بەتایبەت کوردستان دەکاو رۆڵی زانایانی ئایینی بەرچاو دەخا، بەوەی زانایـانی ئـایینیو وتاربێـژی مزگەوتـەکان لـە باشـووری کوردسـتان لایـەنێکی هاوکارو فاکتەرێکی گرنگن بۆ دەستەبەربوونی ئەمن و ئاسایش لەناوچەکەدا[1] .

* * *

[1] - پەیامی زانایان: ژ/٥٥. ئەرشیفی ساڵی ٢٠٠٩ی سایتی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی.

# برگەی سێیەم
# پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئەرکی زانایانی ئایینی

وەك پێشتر باسمان کرد مزگەوت رۆڵێکی کاریگەرو بەچاوی لەناو کۆمەڵگەی کوردیو، زانایانی ئایینیش پێگەیەکی تایبەتو سەنگینیان لەرووی کۆمەڵایەتیەوە هەیە، وە لەهەموو پرس و پێشهاتەکان زانایانی ئایینی (ئەگەر بیانەوێ) توانای گۆڕینی رای گشتیو شێوازی ئاراستەی کۆمەڵایەتیان هەیە، چونکە بە شاهێدی هەموو لایەك ئەو رۆڵە لە کوردستان کاریگەرەو خیتابێکی بەهێزە لە جوڵاندنی شەقامو کۆکردنەوەی جەماوەر لەدەوری یەکتری، نمونەش بۆ ئەمە کاتێ زانایانی ئایینی لە رێی مینبەرەکانەوە داوای بەهاناوەچوونی ئاوارەکانو کۆمەکی کردنی هێزی پێشمەرگەیان کرد، خەڵکێکی یەکجار زۆر بەپیر داواکەیانەوە هاتنو بەلێشاو خەڵك ئامادەیی نیشاندا، لەهەمان کات لەبەرەی بەرگری لە کوردستانو بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەر توانیان ئاستێکی بەرزو هەڵوێستێکی شکۆمەند تۆمار بکەن.

لەلایەکی تریشەوە زۆر جار لە کوردستانو لە ئاستی جیا جیا پەنا براوەتە بەر مامۆستایانی ئایینی، بۆ ئەوەی هاوکار بن لە بەڕێوەبردنی پرۆژەو کارو هەنگاوەکانیانو هۆشیار کردنەوەی خەڵك لەو بارەوە، چەند جار وەزارەتەکانی (تەندروستی، شارەوانی، پەروەردە، مافی مرۆڤ)، بەڕێوەبەرایەتی هاتووچۆو، سەنتەرو ناوەندەکانی ژینگە، کۆمسیۆنی هەڵبژاردنەکان، داوایان کردووە مامۆستایانی ئایینی رۆڵ ببینن لە هۆشیار کردنەوەی هاوڵاتیان بۆ سەرخستنی نەخشەو پلانیان، وە چەندین جار لە رێی میدیاو دەزگا راگەیاندنەکانەوە، یان لەلایەن رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنیەوە، گوێبیستی ئەوە بووین، کە پێویستە مامۆستایانی ئایینی لە پرسە هەنووکەییو هاوچەرخەکان تەکانێك بکەن، چونکە

دەوری ئەوان زۆرترین کاریگەری هەیە، یان چەند جار بۆ پرسی گەنجان و ئافرەتان و مافی منداڵ و گرفتە کۆمەڵایەتیەکان و دیارەی خواردنەوە و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و سوتان و کوشتن و بەرەنگابوونەوەی تیرۆرستان هانا براوەتە بەر مینبەری مزگەوتەکان و داوا کراوە زانایانی ئایینی لەمەڕ هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەو دۆزینەوەی چارەسەری رۆڵ ببینن.

ئەو رۆڵە چ لە رێی مینبەرەکانەوە یان لە رێی کۆڕو سیمینارەوە، یان لە رێی نوسین و توێژینەوە و حوزوری زانایانی ئایینی لە ناو میدیای کوردی و کاری رێکخراوەیی و پەیوەندی نێوخۆیی و دەرەوە، دەورێکی ئیجابی و گەورەی هەیەو، شوێن پەنجەیان لەسەر ئاستی هەردوو مەسەلەی ئایینی و نەتەوەیی دیارە.

وەك چۆن رۆڵیان هەبووە و خاوەن پەرێزێکی پاك و مێژوویەکی پرشنگدارن، دەبێ بەهەمان شێوە کار بکەن بۆ راگرتن و بەزیندوو هێشتنەوەی ئەو مێژووە لە لایەك و، هەوڵدانی پتر لە ژێر رۆشنایی پیشەو پەرێز، بۆ سازاندنی زەمینەی تۆمارکردنی دەسکەوتی زیاتر لەم قۆناغەی ئێستا لەلایەکی ترەوە، بەتایبەت لەمەڕ پرسی دەستەبەرکردن و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانیەوە، وە مامۆستایانی بەرێزی ئاینی بەو موقعە رۆحیەی هەیانە لە ناو کۆمەڵگە، دەبێ خەڵك لەسەر گیانی هاوکاری و هۆشیاری رابێنن، تا پێکەوە بتوانین قیمەی ئەو ئەمنە زیاتر پەرە پێ بدەین و زیاتریش رەنگدانەوەی هەبێ لە واقعی کۆمەڵگەو کیانی نەتەوەییماندا.

بەدیوێکی تر زانایانی ئایینی پێشەنگ و پێشەوای میللەتن و دوانگەیەکی کاریگەریان لەبەر دەستەو خەڵکیش گوێیان بۆ شل دەکا، هەر بەپێی ئەنجامی دوا ئاماری وەزارەتی ئەوقاف کە لە ساڵی ٢٠٠٩ بڵاوکرایەوە، لە کوردستان نزیکەی (٥١٠٠) مزگەوت هەیەو، لەنێو ئەو ژمارەیەش نزیکەی (٢٨٠٠) مزگەوت وتاری هەینیان تیا دەخوێندرێتەوەو هەفتانە پتر لە نیو ملیۆن کەس هامشۆی مزگەوت دەکاو ئامادەی وتاری هەینی دەبێ، ئیدی ناکرێ کاریگەری پەیامی ئەو نێوەندە بەهەند وەرنەگیرێ و بایەخی پتری پێ نەدرێت، کەواتە دەبێ کاریگەری پەیامی ئەو نێوەندە جێی بایەخ بێت و بەهەند وەربگیرێ، وە دەبێ ئەو زەمینە بە

پشت بەستن بە پەیامی ئیسلام و لەچوارچێوەی کاری بانگەوازی و پەیامی مینبەرەوە دەبێ ڕۆڵی زیاتر ببینێ، بەتایبەت لەرووی پاراستنی ئەمنیەت و هۆشیار کردنەوەی خەڵکی لەو بارەوە، لەو سۆنگەشەوە ئەرکی زانایانی ئایینی گرنگ و قورس و هەستیارترە، لەبەر ئەوەی ڕووبەڕوو بوونەوەی زۆر لەبەردەم کورد بوونی هەیەو، ئەگەرو پێشهات و گۆڕانکاری جۆراوجۆریش لە ئارادان.

پێویستە لەرێی دەزگا مەعنیەکان و تەنانەت خودی مامۆستایانی ئایینیەوە بە لەبەر چاوگرتنی پێگەی ئایینی و مەعنەوی و پیشەییەوە ڕۆڵی مزگەوت زیاتر ئەکتیڤ بکرێ لەرێی: وانەی زانستی و ڕۆشنبیری و هۆشیاری و ڕاڤەی دەقەکان لەسەر بنەمای زانستی و ڕوئیا بینی هاوچەرخ و بڵاوکردنەوەی ئامۆژگاری و بایەخدان بە ژینگەی مزگەوتەکان و دانانی پەرتوکخانەو کەسی شیاو بۆ پێشنوێژی و وتاردان و دروستکردنی هەماهەنگی لەنێو وتاربێژان و مزگەوتەکان[1].

هاوکات بۆ ئەوەی ڕۆڵی مامۆستایانی ئایینی پتر لایەنێکی هاوکار بێت لە بەرقەرار کردنی پرسی ئەمن و ئاسایش لەکوردستان، پێویستە کار لەسەر چەند تێڕوانین و بنەماو پرەنسیپ و ستراتیژێك بکرێ، وەك هەمیشە لەناو پەیام و وتارو نووسین و ئامۆژگاری و توێژینەوەو کۆنفرانس و سیمینارو هەڵوێستەکانیان هەستی پارێزگاری لە خاك و گەل و نیشتمان ڕەنگبداتەوەو خەڵکی لەسەر ڕابێنن، ئەوەش لەرێی:

**یەکەم:** سەیرکردنی مەسەلەی ئەمن و ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی، وەك بەشێك لە پێکهاتەی دینداری کەسی موسڵمان و، ئەرکێکی ئیمانی لەسەر شانی هەموو تاکەکان بێ جیاوازی، چونکە تا ئێستاش جۆرێك لە کەمتەرخەمی و بەهەڵە تێگەیشتن و کورتبینی لەو

---

[1] - كيف نحي رسالة المسجد: ٦

بارەوە هەیە، کە دەکرێ زانایـانی ئـایینی کـاری لەسـەر بکـەن و ئـەو ڕێنمـایی و هۆشـیارییە پێویستەی لە دووتوویێی قورئان و سوونەت هاتووە بۆ خەڵکی روون بکەنەوە.

**دووەم:** هۆشیارکردنەوەی گەنجان و برەودان بە لایەنی پەروەردەیی و سلوکیەوە، جـاری وایـە کەمتەرخەمی لە بواری هۆشیاری و دروستبوونی فەراغ لای گـەنجان و سـەرقاڵبوونیان بـە شـتە لاوەکی و ئەفکارە چەوت و بێ بنەماکانـەوە، مەترسـی زۆری بەسـەر ئـەمنی کۆمەڵایـەتی لێ دەکرێت، زۆر جار لە ئەنجامی ململانێی سیاسی و فکـری و ئایدلۆژیـەوە دەرهاوێشـتەی خـراپ سەر هەڵدەدەن و، کاریگەری نەرێنی لەسەر توێژی گەنج و لاوان دروست دەکات.

**سـێیەم:** جـەخت کردنـەوە لەبەرپرسـیارێتی و پـاك راگرتنـی سـومعەی کۆمەڵایـەتی و بڵاونەبوونەوەی دیاردە ترسناکەکان، چونکە جاری وایـە سـەرهەڵدانی کێشـەی کۆمەڵایـەتی و دیاردە قەدەغەکراوەکان، ئاڵۆزی و پشێوی زۆر لـەناو کۆمەڵگـە دروسـت دەکـا و مەترسـیێ لی دەکەوێتەوە، بۆیە لەوەشدا دەبێ مامۆستایانی ئایینی هەمیشە لە وتارەکانیان تیشـك بخەنـە سەر گرنگی هەستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر کۆمەڵگـەو پاراسـتنی سـومعەی کۆمەڵایـەتی و وەستان و بەرهەڵستکاری کردنی دیاردەو حاڵەتە نەخوازراوەکان.

**چـوارەم:** وەسـتان دژی سـەرهەڵدانی نـاکۆکی و تونـدو تیـژی و تـیرۆرو تۆقانـدن، لـەرێی شیکردنەوەی پەیامە گرنگ و گەورەو فراوانەکانی ئیسلام و هەرەشەی ئیسلام لەبارەی ناکۆکی و نانەوەی توندو تیژی و کردەی تیرۆریەوە، چونکە بەهەڵە حاڵی بوون و رووچوون و زیادەرەوی کردن لە شتەکان بەتایبەت لەوەی پەیوەستە بە لایەنی دینداریـەوە، خـاڵێکی خەتەرناکـە بـۆ سـەر ئەمنی قەومی، لەوەشدا زانایان ئەو راستیە دەزانن، کە ئیسلام دژی تونـدو تیـژی و ئیرهابـەو هەموو کارو هەنگاو تەنانەت قسەیەکیش حەرام دەکات، کە زیان بـە ئاسایشـی نەتـەوەیی و نیشتمانی بگەیەنێت.

**پێنجەم:** روونکردنەوەی هەڵوێستی ئایینی و دەستپێخەری ئاشتەوایی و بایـەخی سـازانی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی، لەوەشدا پێویستە زانایانی ئایینی نمونەو وێنایەکی جـوان و لەئاسـت

پێویستو دۆخی نیشتمانیەوە پیشان بدەن، دەكرێ لەرێی وتارەكانیانەوە هۆشیاری بۆ لایەنی پەیوەندارو كیانو هێزە سیاسیەكان بەرز بكەنەوە، بەوەی ئیسلام لەسەر بنەمای ئینسانیو پرنسیپی پێكەوە ژیانو هەماهەنگی كار دەكاو، رێز لە یەك هەڵوێستیو تەبایيو سازانو ئاشتی دەگرێتو، هانی تاكەكانیش دەدات پابەندی لەو بارەوە بنوێنن.

**شەشەم:** لەبەرچاو گرتنی گەورەیی نیعمەتی هێمنیو ئۆقرەییو ئارامیو بەراورد كردنی بە دۆخی ئاڵۆزیو شڵەژانو پشێویەوە، كە ئەمە لەلایەكەوە پەروەردەو هەستی تاك لەمەر بەهرەو نیعمەتە خواییەكان پتەو دەكاو، لەلایەكی تریشەوە زەنگێكی هۆشیاركەرەوە دەداتە هاوڵاتیان، كە كار بۆ ئەمنیەتو بەقەراركردنی ئاسایش بكەن.

**حەوتەم:** هەڵسەنگاندنو نرخاندنی بەها كۆمەڵایەتیو ئینسانیەكان، كە لەمەشدا ئیسلام نمونەو پلانو نەخشەو رێنمایی هەمەلایەنەی هەیەو، لە كۆی دەقەكانیەوە جەخت لەسەر مەسەلەی برایەتیو دادپەروەریو پێكەوە ژیانو یەكسانیو گوێڕایەڵیو پێویستی بوونی كیانو دەسەڵاتو هاوكاریو قبوڵكردنی بەرامبەرو دروستكردنی زەمینەی ئاشتەواییو شێوازی مامەڵەكردنو جۆری پەیوەندییەكانو بنەبڕكردنی ناكۆكیو بیری خۆپەرستیو خۆسەپێنیو زوڵمو ستەمو توندوتیژیەكان دەكاتەوە.

**هەشتەم:** راستكردنەوەی چەمكە هەڵەكان، بەتایبەت لەو پرسانەی پەیوەستن بە ئایینی ئیسلامەوە، چونكە خراپ بەكار هێنانی ئاین بە زیانێكی گەورە تەواو دەبێت، لەبەر ئەوە پێویستە چەمكە هەڵەو كردە نادروستەكان راست بكرێنەوەو، هەرچی گومانو ئەفكاری خراپو لادەرو گومڕاو نەفامانە هەیە رێگەی لێ بگیرێو تەشەنە نەكات.

كەواتە بە كورتیەكەی ئەركی زانایانی ئایینی لەبارەی پاراستنی ئەمنو ئاسایشو بەقەراركردنی ئارامی وڵات، ئەركێكی گرنگو هەستیارە، وە ئەركێكی دونیاییو قیامەتیەو پێویستە وەك چۆن لە رابردوو جێ پەنجەیان دیار بووە، بەهەمان نەفەس لە ئێستاو ئاییندە زیاتر

کۆشش بکەن، هەم بۆ سەلامەتی هەستی دینداری خەڵك و، هەمیش بۆ بەرەودان بە هەستی نەتەوەیی و سەلامەتی کیان و نیشتمان و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییەوە.

# باسی یەکەم
# هەستی نەتەوایەتی و هەڵوێستی ئیسلام

بوونی چەندین نەتەوەو گەل و تیرەوو هۆزوو رەنگ و دەنگ و زمان و رەگەز، یەکێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی دەسەڵات و ویست و ئیرادەو دانایی و زانایی خوای گەورە، چونکە خوای بالآدەست لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بەو راستیە کردووەو لە دوو ئایەتی پیرۆز هێماو ئاماژە گەلێك بۆ مرۆڤایەتی روون دەکاتەوە.

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ)[1]، واتە: یەکێکی تر لە نیشانە و بەڵگەکانی، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویە (کە زاناکانی ئەستێرەناسی لە ئاستیدا سەرسام و سەرگەردانن) و جیاوازی زمان و رەنگتانە (دەنگی هیچ کەس لە کەسی تر ناکات، سەرەڕای سەدەها جۆر زمان، کە جۆری قسەکردن و دارِشتنی هەر گەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، جگە لە هەزاران شێواز کە لەو زمانە سەرەکیانە دەبێتەوە)، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان.

دووەم: خوای بالآدەست دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)[2]، واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرەو هۆزی جۆر بە جۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش

---

[1] - الروم: ٢٢
[2] - الحجرات: ١٣

بێت بە یەکەوە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خـوا ئـەو کەسـانەتانە کـە زۆرتـر لـە خواترسـە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان.

لەژێر رۆشنایی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە دەگەینە ئەو راستیە، کە مەسەلەی بـوونی نەتەوەو گەلو هۆزو زمانو دەنگی جیا جیا لەسەر زەوی، شـتێکی بـە مەبەسـتو شروشـتیو ویسـتراو و ئاساییە، کە هێمایە بۆ گەورەییو بەرفراوانی دەستەلاّتی پـەروەردگاری بەدیهێنـەرو کار لەجێ لەلایەکیو، بوونی کۆمەڵێك ئامانجو حیکمەتو بەرژەوەندی گەردوونیو مرۆیی لـە لایەکی ترەوە.

لەسەر ئەو بنەمایە ئیسلام وەك دواهەمین ئایین نەهاتووە هیچ گەلێك بەسەر گـەلێکی تـر گەورە بکاو بەچاوێکی بەرزتر لێی بڕوانێ، بەڵکو پۆلێنی ئیسلام لەمەڕ ئەو پرسە دەکرێ بلێین لە دوو ئاستەوەیە:

١_ لەسەر ئاستی نەتەوەیی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە هەموویان وەك یەکنو بەیەك چاو سەیری هەموویان دەکات، بێ جیاوازیو پێدانی فەزڵی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەیەکی تردا.

٢_ لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی لەئایینی ئیسلامدا مرۆڤەکان هەموویان نەوەی یەك دایـكو باوکنو یەکسانن لە ئینسانیەتو دروستبوونو بنچینەو مافو ژیاندا، وەك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەو بارەوە دەفەرموێ: (الناس كلهم بَنُو آدَمَ وَآدَمُ خُلِقَ مِـن تُـرَابٍ)[١]، واتـە: خەڵك وەچەو نەوەی ئادەمنو ئادەمیش لە گڵ دروستکراوە. بەڵام پێوەری رێزداری لەتـەرازوی ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ پابەندیو دینداریو ئەنجامدانی کاری چـاکەو خۆپـارێزیو تـەقوا، وەك خوای کار لەجێ لەو ئایەتەی پێشەوە ئاماژەی بۆ کرد (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) واتـە: بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسەو فەرمانبەرداری خوایە.

[١] ـ سنن الترمذي: ب/٥ ل/٧٣٤

لەو سۆنگەوە دەکرێ بڵێین ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەتەوە دۆستەو لەگەڵ ئەوەش نەتەوە ویستە، لەسەر ئەو بنەمایە هەستی نەتەوەدۆستی و سۆزی نەتەوەیی و ئینتماو خۆشەویستی بۆ نەتەوە دادەمەزرێ، هەبوونی ئەو هەستو سۆزو خۆشەویستیە بەپێی زۆرێك لە دەقەكانو لەچوارچێوەی ویستی ئیسلام، نەك شتێكی تاوانو هەڵەو سەرپێچی نیە، بەڵكو داوایەكی شەرعی و پێویستیەكی حەتمەمی و هەنگاوێكی باش و بەجێیە.

چونكە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (**خَيْرُكُمْ الْمُدَافِعُ عن عَشِيرَتِهِ ما لم يَأْثَمْ**)[1]، واتە: باشترینتان ئەو كەسەیە بەرگری و پارێزگاری لە نەتەوەكەی بكات مادام لەسەر گوناه نیە.

لەلایەی ترەوە لەكاتە ناخۆش و حاڵەتە نەخوازراوەكانیش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئامادە نەبووە دەستبەرداری نەتەوەكەی بێت، بەڵكو هەمیشە نزای خێریشی بۆ كردووە، ئەو فەرمودەیە ئاماژەیە بەو راستیە: (**قال عبدالله ابن مسعود كَأَنِّي أَنْظُرُ إلى النبي (ﷺ) يَحْكِي نَبِيًّا من الْأَنْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فَأَدْمَوْهُ وهو يَمْسَحُ الدَّمَ عن وَجْهِهِ وَيَقُولُ اللهم اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ**)[2]، واتە: عەبدوڵلای كوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەرم (درودی خوای لەسەر بێت) وەك پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران دەهاتە بەرچاو، كە نەتەوەكەی لێیان دابوو، زامداریان كردبوو، ئەویش وێڕای خوێن سڕینەوە لە دەم و چاوی دەیگوت: خوایە لە نەتەوەكەم ببورە، چونكە ئەوان نەزانن!

سەیر بكە! سەرەڕای هەموو ئەو كارو كردە نا شەرعی و نادروستانەی قورەیشیەكان دەیانكردو پیلانی زۆرو هەوڵی كوشتنی پێغەمبەریشیان دا، بگرە بەشێكیان هەڵگری كوفرو ئیلحادیش بوون، بەڵام پێغەمبەری ئازیزمان (درودی خوای لەسەر بێت) لەبەرامبەردا هەر بە

[1] - سنن أبي داود: ب/٤ ل/٣٣١
[2] - صحيح البخاري: ب/٣ ل/١٢٨٢

نەتەوەی خۆی ناویان دەبات و بۆیان دەپارێتەوە و نەتەوەدۆستی خۆرسك و خوا كرد لە وشەو فەرموودەكانی دەتكێتەوە.!!

هەروەها كاتێ پرسیاری لێ كرا سەبارەت بەوەی مرۆڤ سۆزو خۆشەویستی بۆ گەل و نەتەوەكەی هەبێ، چۆن وڵام داوەتەوە! وەك هاتووە: (**يا رَسُولَ اللَّهِ أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ قال لَا وَلَكِنْ مِن الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِينَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ على الظُّلْمِ**)[1]، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئایا ئەگەر كەسێك نەتەوەكەی خۆی خۆشبووێ دەچێتە خانەی دەمارگیریەوە؟ فەرمووی نەخێر! مەگەر مرۆڤ لەسەر زوڵم و ستەم و ناهەقی هاوكاری نەتەوەو گەلەكەی بكات.

كەواتە ئیسلام نەهاتووە جیاوازی لەنێوان نەتەوەكان بكا، بەڵكو بە یەك چاو سەیری هەموویان دەكات و هیچ ئاماژەیەكیش نیە بڵێ ئەو نەتەوە فەزڵ و گەورەیی و پلەو پایەی بەسەر نەتەوەیەكی تردا هەیەو لەو باشترە، وێڕای ئەمەش دابەشبوونی مرۆڤ بەسەر نەتەوەو گەل و هۆزو تیرەدا ئامانجگەلێكی لە پشتەوەیە، كە بەشێكیان رەنگە لە ئێمەی مرۆڤ مەعلوم نەبن و نهێنیەكە لای خوا بێت، بەشێكی تری بەهەموو بەش و لێكدانەوەو پێوەرێك دەچێتە خانەی دروستكردنی زەمینەی یەكتر ناسی و تێكەڵاوی و پێكەوە گرێدانی بەرژەوەندیە دینی و دونیاو مرۆیی و شارستانیەتەكانەوە، وەك لەو بەشە پوختەی نێو ئایەتی پێشەوە دەردەكەوێت، كە خوا فەرموی: (**لِتَعَارَفُوا**)..

كەواتە بوونی هەستی نەتەوەپەروەری و سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر نەتەوە، بەشێكە لە موسڵمانێتی و قیەمی دینداری و بگرە ئیسلام هانی مرۆڤیش دەدات، كە گەل و نەتەوەی خۆی خۆش بوێت، وە سەركۆنەی ئەوانەش دەكا، كە بەشێوەیەك لە شێوەكان لەگەڵ ئەو بۆچوونە نین و حاشایی لەو پرسەو نەتەوەییەی خۆیان دەكەن، هەروەك پێغەمبەری ئیسلام دەفەرموێ:

---

[1] - سنن ابن ماجة: ب/٢ ل/ ١٣٠٢

(مَنْ ادَّعَى إلى غَيْرِ أبيه أو انْتَمَى إلى غَيْرِ مَوَالِيه فَعَلَيْه لَعْنَةُ اللّٰهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ لَا يَقْبَلُ الله منه يوم الْقِيَامَةِ صَرْفًا ولا عَدْلًا)[1]، واته: هەر کەسێك حاشا لە باوکی خۆی بکا، یان حاشایی لە تیرەو هۆزو نەتەوەو نەژادی بکات، ئەوە بەر نەفرەتی خوای گەورەو فریشتەو تێکڕای خەڵکی دەکەوێت و هیچیشی لێ وەرناگیرێت.

بەڵام دەبێ ئەو نەتەوەپەروەریەو هەستەو سۆزو خۆشەویستیە بەرامبەر بە نەتەوە، لە چوارچێوەی مەعقولیەت دابێ و سەر نەکێشێ بۆ دەمارگیری و نەتەوەپەرستی، چونکە بە پێی لێکۆڵینەوەی زانایان و ئاماژەی بەشێکی فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لە سێ حاڵەتدا مەسەلەی نەتەوایەتی نیشانەی پرسیار دروست دەکاو دەچێتە خانەی بقەو نادروستیەوە:

یەکەم: ئەگەر هەستی نەتەوەیی بووە ئامرازێك بۆ زوڵم و ستەم و زۆرداری و پێکدادانی مرۆیی و لێ کەوتنەوەی فیتنەو ئاشوب و دەمارگیری.

دووەم: ئەگەر هەستی نەتەوەیی ببێتە هۆکار بۆ بە کەم سەیر کردنی نەتەوەکانی تر و دروستبوونی پلەبەندی مرۆیی، بەوەی لەناو نەتەوەکەت خۆ بە پلە یەك و نەتەوەکانی تر بە پلە دوو ببینیت.

سێیەم: ئەگەر نەتەوایەتی جێی ئایینی گرتەوە، واتە ئەگەر بڕیار بێت مەسەلەی نەتەوەیی جێی ئایین بگرێتەوە، کار بۆ ئەوە بکرێت خەڵك زیاتر رێز لە نەتەوەو هەستی نەتەوەیی بگرێت، نەك لە دین و رێسا شەرعیەکان، ئەوە لەچوارچێوە دروستەکە دەچێتەوە دەرەوە[2].

لەبەر ئەوە دەکرێ بڵێین ئیسلام لەگەڵ نەتەوەپەروەری و هەستی نەتەوەیی دایە، نەك نەتەوەپەرستی و دەمارگیری، هەروەکو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەو بارەوە بە

[1]- صحيح مسلم: ج٢ ص٩٩٨.
[2] - نوێنسازی: ژ/٢ ل/٥٦

توندی هۆشداری دەداتە ئەوانەی دەمارگیری دەکەنە بنەمای سەرەکی بەرامبەر نەتەوەی خۆیان، هەروەکو دەفەرموێ: (ليس مِنَّا مـن دَعَـا إلى عَصَـبِيَّةٍ وَلَـيْسَ مِنَّـا مـن قَاتَـلَ على عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا من مَاتَ على عَصَـبِيَّةٍ)[1]، واتە: هەر کەسێك بانگەشەی دەمارگیری بکاو لەو پێناوەدا شەڕی لەسەر بکاو وە لەسەر بیروباوەڕی دەمارگیری بمرێت لە ئێمە نیە.

هەروەك ناشکرێ مرۆڤ لەپێناو بوونی هەستی نەتەوەیی ناهەقیەکان قەبوڵ بکاو پێی وابێ شتێکی ئاساییە، تەنها لەبەر ئەوەی ئیدعای نەتەوەپەروەری دەکاو ئینتیمای بۆ نەتەوەکەی هەیە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی باس کردووەو دەفەرموێ: (من نَصَرَ قَوْمَهُ على غَيْرِ الْحَقِّ فَهُوَ كَالْبَعِيرِ الذي رُدِّيَ فَهُوَ يُنْزَعُ بِذَنَبِهِ)[2]، واتە: هەر کەسێك لەسەر ناهەقی پشتگیری لە نەتەوەکەی بکات، ئەوە وەك ئەو حوشترە وایە کە کەوتۆتە قۆرتێکەوەو بە کلکی دەری دێنن.

ئەو فەرموودانە ئەوە پیشان دەدەن، کە لەلایەکەوە داکۆکی لە چەمکی نەتەوەدۆستی بەو دیدو هزرە تایبەتیەی ئایینی ئیسلام بۆ مەسەلەی هەستی نەتەوایەتی هەیەتی کارێکی ڕەوایە، لەلایەکی تریشەوە نەتەوەدۆستیو نەتەوەپەروەری شتێکی خۆڕسكو سروشتیەو خوای گەورە لە ناخی هەموو کەسێك رواندویەتی، بۆیە دەبینی لەکاتی پێویست ئەو هەستە خۆی دەنوێنێو لەهەندێ حاڵەتیشدا زۆر بە زەقی دەردەکەوێت.

کەواتە ئیسلام مەسەلەی هەبوونی هەستو سۆزی نەتەوەییو خۆشەویستی بەرامبەر گەل، بە شتێکی باشو هەنگاوێکی پێویستو غەریزەیەکی سروشتی دادەنێت، لەگەڵ ئەوەش هانی تاکەکان دەدات، کە پارێزگاری لە گەلو نەتەوەی خۆیان بکەن.

---

[1] - سنن أبي داود: ج٤ ص٣٣٢.
[2] - سنن أبي داود: ب/٤ ل/٣٣١

کەواتە مرۆڤ دەبێ لە بەرامبەر ئەو ئەرکە دینیو هەڵوێستە دینداریە هۆشیار بێتو، خۆی لەسەر هەستو سۆزی نەتەوەیی رابێنێت، بۆ ئەوەی بتوانێ لە چوارچێوەی شەرعیو لۆژیکی، خزمەتێکی جوانی نەتەوەی بکاتو خۆشەویستی نەتەوەی بەلاوە گرنگ بێو ئەرکی خۆی لەو پێناوە بزانێت.

لەلایەکی ترەوە موسڵمانی هۆشیار ئەو کەسەیە، کە سۆزو هەستی نەتەوەیی تێدا بەرجەستە بووەو وەك خەمخۆرێك لەو نێوەدا دەرەکەوێت، چونکە دەزانێ خوای گەورە مرۆڤی کردۆتە تەواوکەرو براو هاوکارو هاوسۆزی یەکتر، مرۆڤیش هەر بەسروشت کائینێکی کۆمەڵایەتیەو ناتوانێ تەنیا بژی، بەڵکو پێویستی بە خەڵکی تر هەیە ژیانو خێرو خۆشیان لەگەڵ بەرێتە سەرو ئۆقرەیی وەربگرێ، بێگومان ئەوەش لەسەر بنەماو پرنسیپی خۆشەویستیو هەبوونی سۆز دادەمەزرێت، دواجار ئەو سۆزە سەر دەکێشێت بۆ خۆشەویستی نەتەوە، کە داخوازی ئیسلامەو ئامانجیەتی مرۆڤ هەمیشە هەستو نەستی نەتەوەیی تێدا زیندوو بێت.

ئەو هەنگاوەش لایەنێکی گرنگی مەعنەویو هاوکارو هۆکارە بۆ بەرقەرار بوونی مەسەلەی ئەمنیەت لەناو کیانو نەتەوەو نیشتماندا، وەك دواتر باسی لێوە دەکەین.

❊❊❊

# باسی دووەم
# خۆشەویستی نیشتمان و خەمی خاك

خوای گەورە ڕێزی زۆری بۆ مرۆڤ داناوە، یەکێ لە سیماکانی ئەو ڕێزەش نیشتەجێ کردنی مرۆڤە لەسەر ئەم زەویە، لەگەڵ ئەوەش ئەرکی بایەخدان و ئاوەدانی و بەرەو پێشبردنی زەوی بە مرۆڤ سپاردووە، وە زەویشی کردۆتە وێستگەیەك بۆ مرۆڤەکان تا کاروبارەکانیان تێیدا بەسەر بەرن، هەروەك دەفەرموێ: (وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ)[1]، واتە: زەوی بۆ خەڵکی ڕاخستووەو باری هێناوە (تا ژیانی خۆیانی تیادا بەرنە سەر).

هەر لەسەر ئەو زەویە خوای باڵا دەست نەتەوەی زۆرو جیاجیاو فرە زەمان و ڕەنگی خولقاندووە، ئیدی هەر بەپێی سوننەتی ئیلاهی و دەستووری کەونی ئەو نەتەوە دەبێ خاك و شوێنێکی هەبێ ژیانی لێ بەڕێوە ببات! کە ئەوە مافی هەر گەل و نەتەوەو خەڵك و تاکێکە نیشتمانی هەبێ، بەو پێیە: نیشتمان بەو شوێنە دیاری کراوە دەگوترێ، کە مرۆڤ یان ڕاستر بڵێین نەتەوەیەکی دیاریکراو بەپێی پێکهاتەو تایبەتمەندی خۆی ژیان و گوزەرانی تێدا بەسەر دەبات.

ئیمامی شەوکانی دەڵێت: لەگەڵ فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە جیهاندا، وای لێهات هەر (شوێن و وڵات)ە پێشەواو فەرمانڕەوایەتی تایبەت بەخۆی هەبێت، بوونی ئەو فرەییە لە پێشەواو فەرمانڕەواییەش بەپێی شوێنەکان شتێکی ئاساییە، ئەمەش وای کرد خەڵکی دەورووبەرو نزیك لە پێشەواو فەرمانڕەوایەتی هەر وڵاتێك جیاواز بێت لەگەڵ وڵاتێکی تر، بەڵام پێویستە هەمووان پابەندی بڕیارەکانی فەرمانڕەواو پێشەوای وڵاتی خۆیان بن و، کەسیش

[1] ـ الرحمن: ١٠

مەترسی بۆ سەر ئەوەی تر دروست نەکات، چونکە بەرامبەر مافی پارێزگاری و دیفاعکردن لەخۆی هەیە[1].

بەو پێیەش بێت، نیشتمانی هەر کەس ئەو وڵاتەیە کە تێیدا لە دایك بووەو ژیانی تێدا بەسەر دەبات و سنورو دەستوورو فەرمانڕەواو دەستەڵاتی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ نمونە کوردستان نیشتمانی تایبەتی گەلی کوردە، وەك چۆن تورکیا نیشتمانی تورك و ئێران نیشتمانی فارس و سوریا نیشتمانی عەرەب و میسر نیشتمانی میسرییەکانە.

قسەکردن لەسەر نیشتمان و بەستنەوەی بە تێڕوانینی ئیسلام و دروستکردنی قەناعەت و هۆشیاری پێویست لەو بارەوە، قسەکردنە لە پرسێکی پەیوەست بە کۆی تاکەکان و گرنگ لە روانگەی ئیسلامەوە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام کۆمەڵێك شتی دیاری کردووە، کە پێویستە مرۆڤ لەبەرامبەریان هۆشیارو چاوکراوە بێت، وە خوای گەورە لەگەڵ دروستکردنی ئادەمیزاد و لەفیترەت و سروشتی مرۆڤدا هەندێ شتی لەگەڵ خولقاندووە،

بۆ نمونە هەموو مرۆڤێك لەزاتی خۆیەوە خۆی و ماڵ و منداڵ و خزم و کەس و دۆست و دەوروبەرو شوێنی حەوانەوەی خۆی خۆش دەوێت، وە یەکێ لەو شتانەی تر کە مرۆڤ وەك غەریزەیەکی سروشتی حەزی لێیەتی و خۆشی دەوێ خاك و نیشتمانی خۆیەتی.

خۆشەویستی بۆ نیشتمان و خاك و نەتەوە، وەك خووێکی سروشتی لە ناخی هەر مرۆڤێکی ویژدان زیندوو بوونی هەیە، وەك ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێت) لەو بارەوە دەڵێت: ئەگەر خۆشەویستی نیشتمان نەبوایە وێرانە رووی دەکردە شارو دێهاتەکان، بەڵام بەهۆی خۆشەویستی نیشتمانەوەیە ئاوەدانی گەشە دەکاو وڵاتیش ئاوەدان دەبێتەوە[2].

---

[1] - السیل الجرار: ب/٤ ل/٥١٢

[2] - نوێسازی: ژ/٤ ل/١٢٥

کاتێ مرۆڤ لە شوێن و نیشتمانێك لەدایك دەبێ و تێیدا پەروەردەو گەورە دەبێ، لەئاو و خۆراك و بەرهەمی دەخواو هەناسەی ژیانی تێدا هەڵمژی و لەنێو کەژاوەی سروشت و جوانی و خەڵك و پێکهاتەکەی ژیا، هەر لە خۆیەوە سروشتی تێکەڵ بە سروشت و جوانی و پێکهاتەو کەش و هەوای نیشتمان دەبێ و خۆشەویستی خاکەکەی تێدا گەشە دەکا، بۆیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا خۆشەویستی خاك و گیان و ژیانی مرۆڤ پێکەوە دەبەستێتەوەو دەفەرموێ: (**وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِنْ دِيَارِكُمْ مَا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِنْهُمْ**)[1]، واتە: خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان کە خۆتان بکوژن، یان لە وڵات و نیشتمانتان دەرچن ئەوەیان نەدەکرد، مەگەر کەمێکیان نەبێت.

دیاریشە مەبەست لە وشەی (دیار) واتە شوێنی ژیان بەسەربردن و وڵات و نیشتمان، کە زیاتر لە (١٥) جار لە قورئانی پیرۆز هاتووە.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەبارەت بە خۆشەویستی نیشتمان دەسپێشخەر و ڕێنمایکارێکی سەرەکیەو، هەڵوێست و پەیامێکی گرنگ و هەمیشەیی بۆ مرۆڤ بەرامبەر نیشتمان و خۆشەویستی خاك هەڵگرتووە، تا بە هۆیەوە مرۆڤ هۆشیار کاتەوەو هەستی خۆشەویستی نیشتمان و سۆزی نیشتمانپەروەری تێدا بەرجەستەو زیندو بکات.

هەبوونی ئەو هەستە بەشێکە لە کۆی پێکهاتەی دینداری کەسێتی موسڵمان و، ئەوەی خەمی خاك و نیشتمانیشی هەبێ و ڕەنجی پێویست لەو پێناو بدات، ئەوە نیشانەی هۆشیاری و پابەندی و هەستی بەرپرسیارێتیە لە لایەك و، بەجێگەیاندنی ئەرکێکی ئاینییە لە لایەکی ترەوە.

---

[1] ـ النساء: ٦٦

چونکە ئەگەر ورد بینەوە لە ژیانو سیرەو فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەو راستەیمان بۆ دەکەوێت، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) چەندە نیشتمانی خۆی خۆش ویستووەو خەمی لێ خواردووەو نزای بۆ کردووە.

کاتێ لە شاری مەککە لەلایەن قورەیشیەکانەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دوور خرایەوەو کۆچی کرد بەرەو شاری مەدینە، هەستی بەنارەحەتیو نالەباری زۆر کرد، وەك بڵێی هەستو سۆزی نیشتمانو خاکەکەی (شاری مەککە) حاڵەتی دەروونی خستە دۆخێکی وا، کە لەگەڵ دوورکەوتنەوەی رووی خۆی وەرگێڕایەوە مەککەو بفەرمووێ: (وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ وَلَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ)[1]، واتە: سوێند بەخوا ئەی مەککە تۆ بەخێرترین خاکی خوای لای من، وە خۆشەویسترین خاکی لای خوا، ئەگەر خەڵکەکە منیان دەرنەکردبا هەرگیز ئامادە نەدەبووم جێت بهێڵم..

وە کاتێ گەیشتە شاری مەدینە دەربڕینی هەستو خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو شارە بۆ ئەو خاكو نیشتمانە بەوە دەربڕی، کە فەرمووی: (اللهم حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أو أَشَدَّ)[2]، واتە: ئەی پەروەردگارا شاری مەدینەمان بەلاوە خۆشەویست بکە، وەك خۆشەویستیمان بۆ شاری مەککەو بگرە زیاتریش.

لەگەڵ ژیان بەسەر بردنو مانەوەی لە مەدینە هەستو سۆزی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەو شارە بەرز بۆتەوەو زۆر بووە، بەشێوەیەك لە کاتی سەفەرو دوورکەوتنەوە لێی سۆزەکە زیاتر خۆی دەنواندو دەرەکەوت، ئەوەش لە کرۆکی ئەو فەرمودەیە بەدیار دەکەوێت، کە هاتووە: (كان رسول اللَّهِ (ﷺ) إذا قَدِمَ من سَفَرٍ فَأَبْصَرَ دَرَجَاتِ الْمَدِينَةِ أَوْضَعَ نَاقَتَهُ وَإِنْ كانت دَابَّةً حَرَّكَهَا)[3]، واتە: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کاتێ لە سەفەر

---

[1] - صحيح ابن حبان: ب/٩ ل/٢٢
[2] - صحيح البخاري: ب/٢ ل/٦٦٧
[3] - صحيح البخاري: ب/٢ ل/٦٣٨

دەگەڕایەوە (لەدەوروبەرو نزیك مەدینە) لەبەر خۆشەویستی بۆ ئەو شارە، سەیری پێگەو ڕێگەو ڕێچکەکانی مەدینەی دەکرد، وشترەکەی وەپەلە دێخست، ئەگەر وڵاغیش بوایە پێی غار دەدا. مەبەست ئەوەیە لەبەر خۆشەویستی دەیویست زوو بگاتەوە ناو شاری مەدینە.

ئیبنو حەجەر لە راڤەی ئەو فەرموودەوە دەڵێت: (**فيه دلالة على فضل المدينة، وعلى مشروعية حب الوطن، والحنين إليه**)[1]، واتە: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و پێگەی شاری مەدینەو، شەرعیەت و ڕەوایەتی هەبوونی هەست و سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر بە نیشتمان.

لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) خۆشەویستی خۆی بۆ کێوی ئوحد دەربڕیوەو فەرموویەتی: (**هذا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ**)[2]، واتە: ئەوە شاخێکە (ئوحد) ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت.

هەر لەپێناو خەمی خاك و سۆزو خۆشەویستی نیشتمان بوو، کە پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) دوعای کردو فەرمووی: (**رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ**)[3]، پەروەردگارا، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شارو وڵاتەداو خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.

ئەو دەقانەی سەرەوە بەڵگەی بەهێزو راشکاون سەبارەت بە مەسەلەی خۆشەویستی نیشتمان و هەبوونی سۆزی نیشتمان پەروەری، بۆیە پێویستە لەسەر هەر تاکێك خاك و نیشتمانی خۆی خۆش بوێ و کار لەپێناو گەشەسەندن و بەرەو پێش بردنی بکات و پارێزگاریشی بەئەرك دابنێت.

---

[1] - فتح الباري: ب/٣ ل/٦٢١ (هەروەك ئیمامی حافزو ئیمامی عویەینی و مبارکفوری لە کتێبەکانیان هەمان بووچوونیان هەیە) نوێسازی: ژمارە: ٤ ل/١٠٩

[2] - صحيح مسلم: ب/٢ ل/٩٩٣

[3] - ابراهيم: ٣٥

چونکە نیشتمان ماڵی گەورەی هەمووانەو ئەرکی چاو لێ بوونو پاراستنیشی دەکەوێتە ئەستۆی هەمووانەوە، وەك چۆن مرۆڤ حەز بە سەلامەتیو ئارامیو ئاوەدانی ماڵی خۆی دەکات، بەهەمان شێوە ئەرکیشە گیانی نیشتمانپەروەری لەخۆیدا ببینێتەوەو ئارامی نیشتمانی هەمیشە مەبەست بێ، وەك کاریل دەڵێ: شتێکی جوانە مرۆڤ لەپێناو نیشتمان بمرێت، بەڵام لەوە جوانترو باشتر ئەوەیە مرۆڤ بۆ خاكو نیشتمانی خۆی بژێت[1].

لەلایەکی تریشەوە دەبێ هەمووان ئەو راستیە بزانین، کە ئەگەر نیشتمان نەبێ، مرۆڤ دەکەوێتە غوربەتو نائارامیەکی زۆرەوە، جاری وایە مرۆڤ لە نیشتمان دوور دەکەوێتەوە، رەنگە لەرووی ماددیەوە هیچ گرفتیشی نەبێو ژیانو گوزەرانیشی لەو پەڕی باشی بێ، بەڵام دووری نیشتمان وای لێ دەکات هەست بە خۆشیو هێمنی دەروونی نەکات، چونکە مرۆڤ لەکاتی ئاوارەییو دوور کەوتنەوەی لە خاکی خۆی پتر هەست بەوە دەکات، کە نرخو بەهای خۆشەویستی نیشتمانی خۆی چەندە! وەك ئەو پەندەی دەڵێت: (تعرف قیمة الأوطان عند فراقها)، واتە: نرخی نیشتمان لەکاتی دوورکەوتنەوەو دابڕانو ئاوارەیی دەزاندرێت[2].

لەلایەکی تریشەوە هەر لە نیشتمانی ئارامەوەیە مرۆڤ دەتوانێ دینداریو جموجۆڵو کاروبارەکانی خۆی رایی بکات، ئەگەریش نیشتمان نەبوو، یان تێکچوو، یان داگیر کرا، ئەو کات ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ خواپەرستیش ئەنجام بدات.

کەواتە لە ئیسلامدا مەسەلەی خۆشەویستی خاكو نیشتمان، نەك کارێکی خراپو ناڕەوایە، بەڵکو ئەرکێکی خوازراو و ڕەواو بەجێو شەرعیە، لەگەڵ ئەوەش سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) هێما بۆ ئەوە دەکات، کە خۆشەویستی نیشتمان ئەرکێکەو، پێویستە مرۆڤ لەبەرچاوی بگرێتو وەك بەشێك لە هەستی دینداری خۆی بزانێت.

---

[1]- معجم روائع الحکمة: ل/٢٤٣

[2]- هەمان لاپەڕەو سەرچاوەی پێشوو.

# باسی سێیەم

# کوردستان لانکەی دووەمی مرۆڤایەتی و نیشتمانی ڕێزلێگیراو

لەوەو پێش دەرکەوت بەپێی ڕێنمایی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بوونی هەستی نەتەوەیی و خۆشەویستی خەڵك و خاك و نیشتمان شتێکی پێویستەو، بەشێکە لە پێکهاتەو هەستی دیندارانەی تاك لەهەر زەمان و زەمینێکدا، ئیدی ئەگەر لەو چوارچێوە دینداریەوە ئاوڕێك لە سروشت و پێگەو نەخشەو مێژووی کوردستان بدەینەوە، گرنگی و گەورەیی ئەو (نیشتمان)ەمان کە بە (کوردستان) ناسراوە بۆ روون دەبێتەوە، لەوەش زیاتر راستیەکی حاشا هەڵنەگرە، کە خوای گەورە ڕێزی تایبەتی لەو خاکە ناوە! لەگەڵ ئەوەش کوردستان شوێنێکی بە پیت و پیرۆزو ڕێزلێگیراوەو لە قورئانی پیرۆزدا باسی لێوە کراوە، وە بەپێی بەڵگە بە لانکەی دووەمی ژیانی مرۆڤایەتی هەژمار دەکرێ، چونکە لەدوای تۆفانەکەی سەردەمی (نوح) پێغەمبەرەوە یەکەم ئاوەدانی لە بناری چیای (جودی)[1]، لەسەر دەستی حەزرەتی (نوح) دەستپێکردەوەو مێژووی مرۆڤایەتی سەری هەڵدایەوە.

هەر ئەوەشە وای کردووە لە ئاستی مێژوویی و جموجۆڵە سیاسیەکان کورد ببێتە کلیلی کردنەوەی زۆرێك لە کێشەکان[2]، لە ئێستاشدا بۆتە ناوەندێکی ستراتیژی لە رۆژهەڵاتی ناوین و

---

[1] - جودی چیایێکە کەوتۆتە سنووری پارێزگای شەرناخ لە بەشی کوردستانی تورکیا.

[2] - مسعود عبدالخالق لەو بارەوە نوسیویەتی: (تەیموری لەنگ) لە بیرەوەریەکانی خۆی دەڵێ: (لە بەغدا بەرەو شام بەرێ کەوتین، ئامۆژگاریان کردم کە خۆم لە خێڵە کوردەکان لادەم)، لە کۆنەوە مەسەلەیەکی یۆنانی هەبووە بەناوی (گرێی کۆرتیون) واتە گرێ کوێرە، ناویان لە کورد نابوو (گرێی کۆرتیون)، دەیان وت هەرچی بیەوێ گرێ کوێرەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکاتەوەو بەسەریدا زاڵ بێت، ئەوا دەبێ یەکەم جار لەگەڵ کورد رێك

بگرە سەنگێکی تایبەتی لەسەر ئاستی ناوچەکە هەیەو، لەو حەلەشدا مالّی هەموانەو نیشتمانی کوردانە.

بۆ پتر روونکردنەوەی ئەو پرسە پێم باشە ئاماژە بەهەردوو رەهەندی (سروشتی دابەشبوونی مرۆڤ بەسەر نەتەوەی جیا جیا)و (مەسەلەی نیشتنەوەی کەشتی)ەکەی پێغەمبەر (نوح ـ سەلامی خوای لەسەر بێت)، بکەین، کە بە گەورەترین بەلّگەی زیندوو دادەندرێت لەمەڕ پیرۆزیو پیتو بەرەکەتی خاکی کوردستانەوە.

بە پێی تێڕوانینی ئیسلامو لەرووی چوارچێوە بنەڕەتیەکانی (بوون)ەوە، راستیەکی حاشا هەلّنەگرە، کە خوای بالاّدەست مرۆڤەکانی لە دایكو باوکێکەوە دروست کردووەو بەسەر زمانو خاكو رەنگو رەگەزو نەتەوەی جیاجیا دابەشی کردوون، وەك پێشتر ئاماژەمان پێ داو خوای گەورە فەرمووی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا)[1]، واتە: ئەی خەلّکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەمو دایکە حەوایە)و کردوومانن بە چەندەها گەلو تیرەو هۆزی جۆر بەجۆر، تا یەکتر بناسنو پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە.

مەبەست لەو دابەشبوونە ئەوە نیە، کە مرۆڤەکان دژایەتی یەکتر بکەنو یەکتر بچەوسێننەوەو، بە کلتووری فەرهەنگی یەکتر رازی نەبنو، خۆیان بەسەر یەکترەوە هەلّکێشن، بەلّکو ئەو دابەشبوونەی مرۆڤ بەسەر تیرەو هۆزو گەلو نەتەوە لەپێناو ئامانجێکی گەورەی مرۆیی و ژیانیو ژیاریە، کە خوای گەورە ئاماژەی پێداوە: (لِتَعَارَفُوا)، واتە بۆ یەکتر ناسینو ئاشنایەتی یەکترە، کە ئەمە پێویستیەکی کۆمەلاّیەتیو ئینسانیو رۆشنبیریو فەرهەنگیو کەلتووریە.

---

کەویێ، سەلجوقیەکانیش بەهۆی رێککەوتنیان لەگەلّ کورد توانیان لەجەنگی خۆیان لەگەلّ رۆم سەرکەوت مسۆگەر بکەن. سەرچاوە: ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان_ باسێکی مێژوویی کورد: ل/۲۳

[1]- سورة الحجرات: ۱۳.

کەواتە لەڕووی دروستبوونو مرۆییەوە تێکڕای خەڵکی بەیەك خێزان سەیر دەکرێن، لەڕووی دینیەوە تێکڕای موسڵمانان بە یەك ئوممەت هەژمار دەکرێن، لەڕووی دابەشبوونی خاکیشەوە هەر نەتەوەو شوێنێکی تایبەتو دیارکراوی بۆ خۆی (دیاری کردووە یان بۆی دیاری کراوە) نەخشە کێشاوە[1].

کەواتە ویستی خوایە من کوردمو بە کوردیو لەسەر خاکی کوردستانو بەزمانی کوردی وەك مرۆڤێك هاتومەتە دونیاوە، تورکو فارسو عەرەبو روسو چینو هیندو... هتد، بەهەمان شێوە، ئەوە مافێکی سروشتیو خواییە، مرۆڤ ناتوانێ نکۆڵی لێ بکاو کەس دەستەڵاتی بەسەرەوە نیەو (کەسیش خێری پێ نەکردووین) لەوەشدا ئێمەی کورد بەشی باشمان بەرکەوتووە، کە لە لانکەی دووەمی ژیانەوەی مرۆڤایەتی (کوردستان) هاتووینەتە دونیاوەو، ئەم بەشەی خاکەمان لەسەر زەوی پێ براوە.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین، کاتێ خوای گەورە فەرمانی کرد، کە پێغەمبەر (نوح_ سەلامی خوای لێ بێ) بۆ رزگاری خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدان کەشتیەك دروست بکا، ئەویش دەستی بەو کارە کردو کەشتیەکی گونجاوی دروست کرد، دواتر فەرمانی پێکرا کە لە هەر نێرو مێیەك دووان هەڵبگرێ، پاش ئەوە بە ئەمری خوا تۆفانەکە دەستی پێکردو کەشتیەکە بەسەر ئاودا بەرز بوویەوە[2].

دوای تەواوبوونی تۆفانەکە، خوای بالادەست پێغەمبەر (نوح)ی لەوە هۆشیار کردەوە، کە داوای دابەزینو نیشتنەوەی کەشتیەکەی لە شوێنێکی پیرۆزو باش بکات، هەروەك دەفەرموێ: (وَقُلْ رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلًا مُبَارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ)[3]، واتە: بڵێ پەروەردگارا لە شوێنێکی

---

[1] - لەدوای سەردەمی نەتەوەگەریەتی دەوڵەتی هاوچەرخ هەر یەکە لە هەرێم (نیشتمان)و گەل (نەتەوە)و (دەستەڵات) بوونە سێ کۆڵەکەی یاسایی بۆ دروست بوونی دەوڵەت بە پێی (قانون الدولی)، سەرچاوە: ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان_ لاپەڕە: ٤٧

[2] - البداية والنهاية: ب/١ ل/ ١١٦

[3] - المؤمنون: ٢٩

موبارەك و پیرۆز دامبەزێنە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی بۆ ئەوەی لە شوێنی موبارەك و پیرۆزدا دامانبەزێنیت.!

نزای پێغەمبەرێك بۆ دابەزینەوەی لە شوێنێکی موبارەك، بووە جێی قەبوڵبوون و وەرگیراوی لەلای خوای باڵادەستەوە، بۆیە فەرمانی پێ درا کە بە پەیامی ئاشتی و سەلامەتی و داباری‌نی بەرەکەت بنیشێتەوە، فەرمووی: (قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ)[1]، واتە: (ئەوسا لەلایەن خوای گەورەوە) وترا: ئەی نوح وەرە خوارەوە و دابەزە لە کەشتیەکەو لە چیای جودی بۆ دەشتایی بەبێوەیی و سەلامەتی لەلایەن ئێمەوە، بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆو ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان، خەڵکانێکی تریش لەمەو دوا دێن و لە نازو نیعمەت بەهرەوەریان دەکەین.

دواجار کەشتیەکە لەسنووری خاکی کوردستان و لەسەر چیای جودی نیشتەوە، وەك خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: (وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ)[2]، واتە: کەشتیەکە لەسەر کێوی جودی (کە لە کوردستانی باکوورە) وەستاو لەنگەری گرت.

لێرەوە دەکرێ ئاماژە بە خاڵێك بکەین، ئەویش وڵامی ئەو پرسیارەیە، کە ئایا تۆفانەکەی حەزرەتی (نوح) گشتی و سەرتاسەری بووە؟ یان تەنها چەند شوێنێکی گرتۆتەوە؟ لەوڵامدا دەرەکەوێت کە ئەو پرسە بۆتە جێی مشتومڕی زانایان، بەشێکیان پێیان وایە ئەو تۆفانە تەنها چەند مەملەکەتێکی تایبەتی گرتۆتەوە و گشتی نەبووە، بەڵام بەشی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوەن، کە تۆفانەکە سەرتاسەری بووە و تێکڕای سەر زەوی و جیهانی گرتۆتەوە، بە بەڵگەی:

**یەکەم:** خوای گەورە دەفەرموێ: (وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ)[1]، واتە: تەنها نەوەی (نوح)مان هێشتەوە، کە ببنە هۆی ئاوەدانکردنەوەی زەوی سەر لەنوێ. کە ئەوە ئاماژەیە بەوەی لەگەڵ

---

[1] - هود: ٤٨
[2] - هود: ٤٤

ئەم تۆفانە کەس نەماوە تەنها نەوەکانی (نوح) نەبێ، کەواتە سەرتاسەری بووە، هەروەك ئیبن کەسیریش لەو بارەوە دەڵێ: هیچ کەسێك لەسەر زەوی نەما نە گەورە نە گچکە، تەنانەت هیچ زیندەوەرێك وجودی نەمابوو[٢].

**دووەم:** زانایانی زەوی ناسی (جیۆلۆجی) ئەوە دەڵێن: کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بەرزایی چیاکان بۆیان دەرکەوتووە، کە پاشماوەی ئاژەڵی ناو ئاو لەسەر لوتکەی چیاکان دۆزراوەتەوە، کە ئەمەش هێمایە بەوەی تۆفانەکە سەرتاسەری بووە[٣].

لە ئەنجامی ئەو زانیاریەی سەرەوەو وەرگرتنی رای زۆرینەی زانایان، بەوەی تۆفانەکە گشتی بووەو کۆی شوێنەکانی سەر زەوی گرتۆتەوە، دەگەینە دوو خاڵی گرنگ:

١_ نیشتەجێ بوونی (ئادەم) لەسەر زەوی و پەیدا بوونی نەوەکانی لەسەر خاکی هیندستان، ئەوە دەگەیەنێ کە وڵاتی هیندستان لانکەی یەکەمی مرۆڤایەتی بووە، بەهەمان چەشن کوردستان بە لانکەی دووەمی مرۆڤایەتی دادەندرێت، چونکە کەشتیەکەی پێغەمبەر (نوح_ سەلامی خوای لەسەر بێت) لە کوردستان نیشتۆتەوەو، ژیان دووبارەو سەر لەنوێ لەسەر ئەو خاکە دەستی پێکردۆتەوە.

٢_ ئەوەش دەسەلمێ کە کورد وەك نەتەوە لەگەڵ دەسپێکردنەوەی ژیانی مرۆڤایەتی لەدوای نیشتنەوەی کەشتیەکەی پێغەمبەر (نوح) بە کۆنترین نەتەوەی سەر خاکی خۆیان هەژمار دەکرێن[٤].

---

[١] ـ الصافات: ٧٧

[٢] ـ البداية والنهاية: ب/١ ل/١١٣

[٣] ـ قصص الأنبياء: ل/٣٦

[٤] – باسێکی مێژووی کورد، لە کتێبی (ناسنامەی حزبە کوردستانیەکان) لە نوسینی بەرێز (مەسعود عبدالخالق) ئەو بابەتە روون کراوەتەوەو کۆمەڵێك زانیاری وردو دیکۆمێنتی خستۆتە روو، بۆ گەڕانەوەی سەری دەکرێ لە چاپی دووەمی لاپەرە: ١٦ بەو لاوە زانیاری پتر وەربگری.

ئەو خستنە ڕووە بۆ ئەوە بوو خوێنەری کوردو تاکی کوردی بەرچاوی روون بێت، کە کوردستان وێڕای ئەوەی نیشتمانی کوردانە، لەهەمان کات بە لانکەی دووەمی مرۆڤایەتی دادەندرێت، بە ( منزلا مبارکا) شوێنی موبارەك لە قورئان باسی لێوە کراوە، ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگە بۆ هەموو لایەك، کە کوردستان نیشتمانێکی پیرۆزەو رێزی لێ نراوە، ئەوەش شانازیەکی گەورەیە بۆ ئێمەی کورد کە خاوەنی ئەو خاکە بە پیتو پیرۆزەین.

ئەو راستیو وێناو واقعەش دەبێ هاندەرو فاکتەرێکی گرنگو گەورە بێت، کە بەو پەڕی دڵسۆزیو هەستی بەرپرسیارێتیەوە مامەڵە بکەینو، ئەرکی پاراستنو دیفاع کردن لە خاكو نیشتمانمان وەك ئەرکێکی ئایینیو ئەخلاقیو ئینسانی سەیر بکەین.

***

# باسی چوارەم
# پاراستن و پارێزگاری نەتەوەو نیشتمان ئەرکێکی ئایینیە

بە پشت بەستن بەو بەڵگانەی پێشەوەو چەندین بەڵگەی تر، سەرەنجام دەگەینە سەر ئەو بڕوایە، کە مەسەلەی پارێزگاری کردن لە نەتەوەو نیشتمان و پاراستنی ئەمن و ئاسایشی وڵات، فەرزێکی ئایینی گرنگە لە سەر شانی تاکەکان.

لەپێناو ئەو ئامانجەش بەدرێژایی مێژووی ئیسلام و ژیان و سەرگوزشتەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) هەڵوێستی گەورە تۆمار کراون، وەك بەشێکی دانەبڕاو لە هەست و سۆزە ئیمانیەکە حیسابی بۆ کراوە، تەنانەت موسڵمانانی پێشوو لەو پێناوە قبوڵی ئازارو مەینەتی و مردن و تەنانەت شەهیدبوونیشیان کردووە، لەبەر ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە، کە سەلامەتی و ئەمنیەت و سەربەرزی (نیشتمان) شکۆو سەربەرزی دینداری و ئیمان و موسڵمانێتیە، چونکە دین و نیشتمان وەك رۆح و جەستە وان، بەو پێیەش دین بێ بوونی نیشتمان وەك رۆحی بێ جەستەیە، نیشتمانی بێ ئایینیش وەك جەستەی بێ گیان وایە.

لەلایەکی ترەوە (وەك پێشتر قسەمان لەسەر کرد) خۆشەویستی گەل و بوونی هەستی نەتەوەیی و گیانی نەتەوەپەروەری لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا شتێکی فەرمان پێکراو و شەرعیەو، مرۆڤ هان دەدا بۆ تێکۆشان لەپێناو ئەو ئامانجە، هەروەها خۆشەویستی نیشتمان بەشێکی هەرە دیاری نێو سوونەت و ژیانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) بووە، هانی مرۆڤیش ئەدات نیشتمان و وڵات و خاکی خۆی خۆش بوێ، کەواتە پارێزگاریکردن و پاراستنی ئەمن و ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی ئەرکێکی ئایینیە.

یەکێ لە بنەما گرنگ و گشتگیرەکانی ئیسلام بریتیە لە هەبوونی هەست و هەڵوێستی پارێزگاری و پاراستنی تایبەتمەندیەکانی ژیان و مرۆڤ، لەبەر ئەوە لێهاتوویی و جورئەت و

تەنانەت سەرنانەوەش لەپێناو کیانو ژیانو سەلامەتی ماڵو حاڵ بەرز نرخاندووە، بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) زۆر جوان ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە مەسەلەی پارێزگاری کردن لە نەتەوەو ئایینو ژیانو سامانو خانەوادە، ئەرکێکی ئیمانیەو تیا چوونیش لەو پێناوە پلەی شەهادەتو سەربەرزی دەبەخشێتە مرۆڤو پاداشتی بەخێریشی دەدرێتەوە، هەروەکو دەفەرموێ: (**مَن قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ**)[1]، واتە: هەر کەس لە پێناو ماڵو سامانو دینو خوێنو خاو و خێزانی بکوژرێ ئەوە شەهیدە.

یاخود دەفەرموێ: (**خَيْرُكُمْ الْمُدَافِعُ عن عَشِيرَتِهِ ما لم يَأْثَمْ**)[2]، واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە بەرگریو پارێزگاری لە نەتەوەکەی بکات مادام لەسەر گوناه نیە.

لە فەرمودەیەکی تر هاتووە: (**عن أنس بن مالك قال جاء رجل إلى النبي (ﷺ) فقال يا رسول الله أمِنَ العَصَبِيةِ أن يُعِينَ الرَّجلُ قَومَه عَلى الحقِّ؟ قال: لا**)[3]، واتە: ئەنەسی کوڕی مالك بۆمان دەگێڕێتەوە، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)و پرسیاری لێ کرد، ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێك لەسەر هەق هاوکاری گەلو نەتەوەکەی بکات دەمارگیریە؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، واتە هاوکاری کردنی نەتەوەی خۆت لەچوارچێوەی شەرعدا شتێکی رەواو لەجێیەو تاوان نیە، چونکە باشترین کەس کەسێکە پارێزگاری لە نەتەوەی خۆی بکات، بەو مەرجەی تاوانباری تیا نەبێتو بە ئەندازەی پێویستو رەوایەتی بێت.

هەستی پارێزگاریو داکۆکی کردن لە مافی نەتەوەیی لە دیدی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەستێکی زیندووە بووە، بە ئەندازەی ئەوەی حەزی کردووە مرۆڤ لەژێر تالای نەتەوەکەی بجەنگێت، هەروەکو لەو فەرموودەیە هاتووە: (**عن عَمَّارٍ أَنَّ النبي صلى اللَّهُ عليه**

---

[1] - سنن الترمذي: ب/٤ ل/٣٠

[2] - سنن أبي داود: ب/٤ ل/٣٣١

[3] - سنن البيهقي الكبرى: ب/١٠ ل/٢٣٤

وسلم كان يَسْتَحِبُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُقَاتِلَ تَحْتَ رَايَةِ قَوْمِـهِ)[1]، واتە: لە عەممارەوە گێڕدراوەتـەوە، کـە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) حەزو ئارەزووی لەوە بووە هەر کەسە لە ژێر ئاڵای هـۆزو نەتەوەکەی خۆیدا بجەنگێت.

ئەمە وێڕای ئەوەی ئاماژەیە بە بوونی هەستی نەتەوەیی خۆڕسك، لەهەمان کـات هێمایـە بەوەی مرۆڤ بەو هۆیەوە ئامـادە نیـە ئـاڵای نەتەوەکـەی بنـەوێتو شکسـت بخـوات، چـونکە وەستانو جەنگانی هەر کەسێك لە ژێر ئاڵای نەتەوەکەی، نـەك هـەر کـارێکی چـاکە، بـەڵکو لەلایەن پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت) کارێکی باشو فەرمان پێکراویشە.

بە پێـی دەرهاوێشـتە بنچـینەییەکانی ئـەو فەرموودانـەی پێشـەوە، وەك چـۆن پاراسـتنو پارێزگاری لە سامانو شەرەفو دینو ژینی مرۆڤ ئەرکێکی پێویسـتە، بەهـەمان شـێوە کـاتێ کۆمەڵگەو کیانو نیشتمانیش دەکەوێتە مەترسـیەوە پارێزگـاری کردنـی پێویسـتەو، تۆیـاڵی پاراستنی دەکەوێتە ئەستۆی تاکەکانەوە، چونکە ئەگەر ئاسایشی نەتەوەییو نیشـتمانی تێـك چوو، ئەوە سەرجەم بەرژەوەندیە تایبەتیو گشتیەکانیش دەکەونە بـەر هەڕەشـەو مەترسـیەوە، هەر کات دەستێکی دەرەکی هێرشی هێنایە سەر نیشتمانو ئەمنی قەومی خسـتە ئاڵۆزیـەوە، واجبە مرۆڤ دیفاع بکاتو، دەبێ ئەو دیفاع کردنەش وەك بەشێك لە دینداری سەیر بکات.

بە پێچەوانەوە ئەگەر مرۆڤ بەو ئەرکە هەڵنەستیو هەستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر خـاكو خەڵکی تێـدا زینـدوو نـەبێ، ئـەوە لـە لایـەنی دینداریـەوە گوناهبـار دەبـێو بـە ئەنـدازەی کەمتەرخەمی لەهەمبەر ئەو پرسە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، لەرووی دونیاییو هەڵوێستی نیشتمانیشەوە ڕووبەڕووی جۆرێك لە شەرمەزاریو ڕیسوایی دەبێتەوە.

لەو بوارەوە شێخ محمدی خاڵ زۆر جوان ئەوەی تاوتوێ کردووەو هەستو ئەستی نەتـەوەییو نیشتمانیانەی خۆی دەربڕیوە، لەگەڵ ئـەوەش تامەزرۆیـە خـەڵك لەسـەر ئـەو بنەمایـە خـۆی

---

[1] ـ المستدرك على الصحيحين: ب/٢ ل/١١٦

رابێنێ و هەستی پارێزگاری نیشتمان لەخۆیدا بەرجەستە بکا، ئەو دەڵێ[1]: (( هەر کەسێك کوڕی باوکی خۆی بێ، بەدڵ و بە گیان نیشتمانی خۆی خۆش ئەوێ، وە هەمیشە هەوڵ ئەدا بۆ زیندوو بوونەوەو سەرکەوتن و بەرز بوونەوە، وە نایەڵێ دوژمن دەستی بۆ درێژ کاو زیانی پێ بگەیەنێ، کەوابوو پێویستە بۆ هێشتنەوەی ژیان و گیان وە بۆ پاسی نام و نیشان، خۆشەویستی نیشتمان وە بەسەرو ماڵ دریغ و کۆتاهی نەکردن لە رێی نیشتمانا، چونکە هەر وابووە هەر گەلێ لە رێی نیشتمانیا دریغ و کۆتایی کرد بێ، ریسواو رەزیل و زەبوون و دیل بووە )).

لەوەش زیاتر شێخی خاڵ چەند وێنایەك دەخاتە بەر هزری مرۆڤ، سەبارەت بە پێویستی هەستی نیشتمان پەروەری و پارێزگاری کردنی، دەڵێ: (( مەل بە مەلیی خۆیەوە بە دەنووك جەنگ ئەکا لەسەر هێلانەکە، وە تا بتوانێ نایەڵی کەس دەستی بۆ درێژ کات و زیانی پێ بگەیەنێ، هەنگ بە چزووەکەی پاسی نیشتمانی خۆی ئەکات، وە هەر کەسێك دەست ببات بۆ کەلووی شانێکی پێوەی ئەدات، لەگەڵ ئەمیشە کە بەو پێوەدانە هەنگەکە خۆی ئەمرێ، کەوابوو هەنگەکان بۆ پاسی نیشتمانی خۆیانن. لان کە بێشەو نیشتمانی شێرە ئەگەر کەسێك نزیکی بکەوێتەوە شێرەکە ئەیشکێنێتەوە، هەر بەم رەنگە هەموو گیانلەبەرێك وایە! کەوا بوو ئادەمی ئەبێ زۆرتر خۆشەویستی بۆ نیشتمان ببێ، چونکە لە هەموو گیانلەبەرێك ژیرترو بەبیرترو زانا ترو دانا ترە )).

مەسەلەی خۆپارێزی و پارێزگاری لەخۆکردنی نێو گیانەوەران، بۆتە جێی باس و لێ وردبوونەوەی زۆرێك لە زانایان، چونکە ئەوە بە فاکتەرێکی پاڵپشت و گرنگ دادەنێن بۆ دروست بوونی هەستی پارێزگاری نیشتمان لەهزرو بیری مرۆڤەوە.

ئەو هەستە لەنێو گیانەوەران زۆر بە زەقی دیارەو رەنگدانەوەی بەسەر رێژەیەکی بەرچاو لە گیانداران هەیە، کە لە کاتی بەگژیەکداچوون و هێرشی بەرامبەر! یان گیانەوەرێکی درندەو

---

[1] - نالەی دەروون: ل/٥٣

نامۆ، زۆر بە روونی دەرەکەوێت، ئەمەش کارزانیو حیکمەتی خوای پەروەردگاری تێدایە، ئەگەر ئەم گیانی رەگەزویستی خۆرسکە نەبوایە، بێچوەکان لەلایەن هاورەگەزەکانیانو لەلایەن داکەکانیان ناپارێزرانو، لە ماوەییێکی زۆر کەم زۆرێکی زۆر لە زۆرینەی رەگەزەکانی گیانلەبەرانیش لە نێو دەچوون[1].!

کەواتە بە کورتیەکەی لە ئیسلامدا پارێزگاری کردن ئەرکێکی هەمیشەییو دانەبڕاوە لەسەر شانی تاك، وە کارێکی فەرمان پێکراوەو پێویستە مرۆڤی موسڵمان درێغی نەکاو لەو پێناوە جوهدو رەنجی زۆر بکێشێت، چونکە سەربەرزی نیشتمانو پارێزراوی نەتەوەو نەکەوتنە مەترسی دۆخی ئەمنی هەر وڵاتێك، گەورەترین نیعمەتی خوایەو بگرە شکۆمەندترین شەرەفیشە بۆ مرۆڤو جوانترین تاجیشە کە مرۆڤ شانازی پێوە بکات.

***

[1] - نوێنسازی: ژ/٦ ل/٢٣

# باسی پێنجەم
# کوردستان لەنێوان ئایینو ئەمنو ئارامی

سەبارەت بە ئەمنو ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان لای ئێمەی کورد، دەکرێ بڵێین لە ئاستێکی باش دایەو لە ئاست دۆخەکەو ئەو ئاڵۆزیو پشێویەی بوونی هەیە تەنانەت بە بەراورد لەگەڵ بەشێکی وڵاتانی دراوسێو عیراقو ناوچەکە لە دۆخێکی ئارام دایە، بەڵام لە هاوکێشەی ئەو رەوشە سیاسیە ئاڵۆزەی ئێستاو ئەو تەحەدیاتە دەرەکیو ناوەکیانەی کە هەیە، پێویستە بزانین لاپەڕە بەهێزەکان کامەنو لاپەڕە بێ هێزەکان چین!؟

لەسەر ئەو رێڕەوە چاوخشانەوەیەك بە مەسەلەی ئاسایشو ئارامی خۆمان بکەین، بۆ ئەو مەبەستە پێویستمان بە راوێژو موشاوەرەی هەمەلایەنە هەیە، بۆ دیار کردنی بڕیاری دروستو چارەساز تا بتوانین بگەینە ستراتیژیەتو پلانی تایبەت بەو پرسەو کەڵکی لێ وەربگرین، بە تایبەت لە جیهانی ئەمرۆ کە جیهانێکی ئاڵۆزو تا رادەیەك موعەقەدە، لەلایەکی تریشەوە لەژێر ئەزمونی وڵاتانی پێشکەوتوو و پێکهاتەی بەهای ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیو ئابووری سوود وەربگرینو گەشە بەو لایەنەوە بدەین.

هەرچەندە لە قۆناغی ئێستادا تەشکیلەی ئاسایشی نەتەوەییو نیشتمانی بە پێی دەستوور رێك دەخرێو، هەموو وڵاتانی دونیا بە وڵاتانی ئیسلامیشەوە دەزگاو ئەنجومەنی تایبەت بەو پرسەیان هەیە، کە فاکتەرێکی گرنگە بۆ رێکخستنی چوارچێوە پەیوەستەکانی ئەمنیەتو پاراستنی دۆخی ئارامی هەر وڵاتێك، وە زۆرێکیش لە وڵاتان بە زەبری هێزو چەكو پلانی سەربازی پەرە بە ئەمنیەتی خۆیان دەدەن، بەڵام رەنگە ئەو هەوڵە بۆ ئێمەی کورد وا ئاسان نەبێ، چونکە لە لایەکەوە بە فەرمی دەوڵەت نینو لەلایەکی تریشەوە بەهۆی وابەستەییمان بەعێراقو تێکەڵاوی سنوورەکان نەتوانین بەپێی ویستو حەزی خۆمان هەموو

کارێك بکەین، ئەمە لە حاڵێکدا هەندێ جار مەترسی وڵاتە دراوسێیەکانو، زۆرجاریش هەڕەشەی تیرۆر وای لێکردووین دۆخی ئارامی هەرێم بکەوێتە بەر جۆرێك شڵەژانو پشێویەوە.

لەبەر زەروورەتی مەسەلەکەو پاراستنی ئەمنیەت، ئەوەی پەیوەستە بەو لایەنە دەتوانێ بەپێی زانیاریو پلانی تایبەتەوە، کار لەسەر رەوشەکە بکاتو بڕیار لە بەرژەوەندی مانەوەو سەلامەتی دۆخی ئەمنی دەر بکا، چونکە مەعنیە بە گرنگیدان بەو پرۆسەیەو دەبێ هۆشیار بێ لەمەڕ ئەگەرو پێشهاتو کۆی ئەو ئاستەنگانەی وەك خەتەرە دێنە پێشو مەترسی دەنێنەوە.

ئەوەشی هاوڵاتیەو هەستی دینداری تێدا زیندووە، دەکرێ وەك ئەرکو هەستکردن بە مەسئولیەت بایەخ بەو لایەنە بداتو هاوکاری پێویست بنوێنێو خۆی بەخاوەن خەم لەبەرامبەر پاراستنی نەتەوەو ئاسایشی نیشتمانی بزانێت.

بوونی پەیوەندیو پەیوەستبوونی هاوڵاتی بە هەستی پارێزگاریو پاراستنی خەڵكو خاك، هۆکارێکی سەرەکیە بۆ هاوکار بوون لە بەرەو پێشەوە بردنی ئاسایشو ئارامی نەتەوەو نیشتمانو، تێکشکاندنی هەموو ئەو بەربەستانەی دەبنە درك لەبەردەم ئەمنیەت لە هەر وڵاتدا.

خۆشەویستی نەتەوەو نیشتمانو مەسەلەی پاراستنی ئەمنو ئارامی شتێك نیە تەنها بە بانگەشەیەك ئیکتیفا بکرێو بەس، بەڵکو دەبێ دەرهاوێشەو کاریگەریەکانی لە سەر ئەرزی واقیع دەرکەون، چونکە خۆشەویستیو هەوڵی راستەقینە ئەو کات جێ دەگرێت، کە لەهەڵسوکەوتو رەنگو روخسار، بەرامبەر خۆشویستراوەکە بەدیار بکەوێت، ئەگەر دڵیش ئەو بڕیارەی دا، دەبێ کاردانەوەی لەسەر ئەندامو جوڵەو رەفتارو کرداری مرۆڤەوە هەبێت، ئەوەی بانگەشەی خۆشەویستی خاكو خەڵکیش بکات، دەبێ بە کردەوە ئەوە بسەلمێنێ، کە پاراستنی ئارامی وڵاتو پارێزگاری کیانی نەتەوەییو نیشتمانی ئەرکێکی لەپێشەو، پێویستە وەك بەشێك لە بنەمای دینداریو ئەخلاقیو ئینسانی سەیر بکرێو رەنجی لەپێناو بدرێت،

هەروەك بەدیوێکی تریش دەبێ ئەو هەستە ببێتە پاڵنەری دروستبوونی ئارەزووی پێشکەوتنی نەتەوەو خاك لەهەموو رووێکەوە، تەنانەت بەرووە دینداریەکەشەوە.

چونکە لە کوردستان بەشێکی موسڵمانان لەبەر شۆڕبوونەوە بە ناخی ئایینیو پابەندیان بە دینداریەوە خەم لە لایەنی نەتەوەییو نیشتمانیو پرسی ئەمنو ئارامی وڵات ناخۆنو ئەو هەستەیان پەراوێز خستووە، هەروەك بەشێکیش لەبەر قوڵبوونەوە لەهەستی نەتەوەییو نیشتمانی هەستە دینداریەکەی کزو لاواز کردووە، کە پێم وابێ ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ کورتبینیو خوێندنەوەی سەرپێی بۆ سیستەمو بنەمای شەریعەتەوە، لەکاتێکدا ئیسلام مەسەلەی دینو دەوڵەتو کیانو کۆمەڵگەو ئەمنو ئارامیو نەتەوەو نیشتمان بە تەواوکەرو دوانەی یەکتر سەیر دەکاو، بگرە لەو بوارەدا جەخت لەوە دەکاتەوە، کە مرۆڤ دەبێ خێری دینو دونیاو خاكو خەڵکی هەبێت.

دەبێ ئەوەش بڵێین بەپێی ئەزموونی زۆرێك لە وڵاتانو واقعی هەندێ قۆناغی مێژوویی دەرکەوتووە، کە ئەوانەی بەشێوەیەك لە شێوەکان توندگیری ئایینیان هەیە، یان ئەوانەی لە ژێر رکێفی سۆزو عاتفە خوێندنەوە بۆ شتەکانو دەکەنو، بەو چاویلکەش لە ئایندەو دۆخی نەتەوەیی خۆیان دەڕوانن، بەزۆری وابووە خەمی نەتەوەو نیشتمانیان پەراوێز خستووەو لەو بوارە هەنگاویان کورت بڕو لاواز بووە! جاری واشە لەدەرەنجامی درێژبوونەوەو هەڵکشانی ئەو ئاسۆیە، بەدواداچوونو باسکردنی پرسی نەتەوەییو نیشتمانی بەلایانەوە وەك تاوانێك سەیر کراوە، بە بیانووی ئەوەی ئەو مەسەلانە لەگەڵ کرۆکی ئیسلام یەکانگیریان نیەو نێوانیان لێك دوورەو بەینیان هەیە.

یان جاری وابووە کار کراوە بۆ ئەوەی جموجۆڵو چالاکیو بانگەشەکانی پەیوەست بە قوڵکردنەوەو جوڵاندنی هەستی نەتەوەیی ناشیرین بکرێو گومانی بخرێتە سەر، ئەوەشیان بە بیانووی ئەوەی ئەو جۆرە هەوڵانە سەرەنجام دژایەتیەك بەرامبەر ئیسلام بەرپا دەکەن.!!

ئیدی ئەو دوو تیۆرە زۆرێك لە گەنجو لاوانی وڵاتانی بە ئاقارێکی وشكو دوورەپەرێزو یاخیو بێ مویالات بەرامبەر بەرپرسیارێتی نەتەوەییو نیشتمانی بردووە، زۆر جار هەم توندڕەویو سەرگەردانیو سەرەڕۆیی لێ کەوتۆتەوە، هەمیش کەلێنێکی لە یەکریزیو هەڵوێستو هەماهەنگیو یەکخستنی نێوخۆییو ئەمنیەتو بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییو نیشتمانی چێ کردووە.

لەبەر ئەوە دەبێ هەموومان ئەوە لەبەر چاو بگرین، کە کوردستانی خۆشەویستمان، بە پەیڕەوکردنو رەهەندی هەستی دینداریو نەتەوەییو نیشتمانی کەوتۆتە سەرپێو، لەو چوارچێوەشەوە بۆتە شوێنێکی ئارامو دۆخە ئەمنیەکەی سەقامگیر بووە، وە ئەو هەستە دینداریە جوانەی میللەتی کوردو رۆڵی مزگەوتو زانایانی ئایینی بەئەندازە خۆیی کاریگەر بووە، کە وای کردووە کوردستان وەك ناوەندێکی پابەندو ئاشتیخوازو ئایین دۆست لە سەر ئاستی رۆژهەڵاتی ناوین وەك ناوەندێکی کاراو پەرێز پاكو دروستو رەسەن جێی خۆی بکاتەوە.

بۆیە پێویستە کار بۆ هۆشیاری پتر بکرێتو سۆزو هەستی پاراستنو بەرپرسیارێتی ئەمنی لەناو کۆمەڵگە پتر بڵاوبکرێتەوە، وە دەبێ لایەنە پەیوەندارەکانو بەتایبەت دەزگاو ناوەندە ئایینیەکانو مینبەری مزگەوتو گوتاری زانایانی ئایینیو میدیاو پەروەردەو بزاڤە رۆشنبیریەکان زیاتر بەو ئاراستەیە هەنگاو بنێن.

***

# باسی شەشەم
# مافەکانی نیشتمان لەدیدی ئیسلامەوە

## برگەی یەکەم: هەبوونی ئینتمای نیشتمانی

لەبەر ئەوەی نیشتمان شوێنی هاتنە دونیاو فێربوونو خواپەرستیو ئومێدو ژیانە، وە نیعمەتی گەورەو گرنگو نزیکی ئینسانە، پێویست دەکا مرۆڤ ئینیتمای بۆ هەبێو هەستو نەستی لە چوارچێوەی شەرعیدا بەرامبەر دەربڕێ، هەبوونی ئەو هەستە نیشانەو بەڵگەی دڵسۆزیو وەفاو ئەمەکە.

زانایان هەمیشە باسیان لەوە کردووە، کە هەبوونی ئینتیماو هەستی پارێزگاری کردن لە نیشتمان ئەرکێکە لەسەر شانی تێکڕای تاکەکان، چونکە ئەم ئەرکە بەشێکە لەشەریعەتو لەگەڵ ئەوەش دەیان نمونەی زیندوو لەناو فەرهەنگی ئیسلامەتیو تەنانەت ژیانی پێشەواو پێغەمبەری ئازیزمان (محمد_ دروودی خوای لەسەر بێت)[1]، سەبارەت بە خۆشەویستی نیشتمان بوونی هەیە.

لەبەر ئەوەی نیشتمان پێگەو نرخی تایبەتی هەیەو ئینتیمای نیشتمانیش تەنها دروشمێکی سادە نیە، بەڵکو بەشێکە لە عەقیدەی کەسی موسڵمانو پارێزگاری کردنیشی واجبێکی پیرۆزە.

نیشتمان بایەخی خۆی هەیە، لەچوارچێوەی ئەو ئاسۆیە گەلان دەتوانن پەرە بە پێشکەوتنی خۆیان بدەنو بگەنە وێستگەی بەختەوەریو سەرفرازی.

---

[1] - تەنانەت گریانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەسە بۆ ئاماژەکردن بۆ زیندوێتی ئەو هەستە بەلای ئەوەوە. فەرموودەکە پێشتر روونکراوەتەوە.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام رێنمایی دەداتە مرۆڤ بەوەی ئینتیمای نیشتمانی لایەنێکی ئیمـانو دینداریە، چونکە بێ نیشتمانیو دووره ولاتیو ئاوارەیی مرۆڤ رەبەنو داماو غـەریب دەکـاو، هەستی ئازادیو رێزو بەهاو ژیانی ئاسایی لێ تەسك دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوانە بێ بـوونی نیشتمان دەستەبەر نابن.

کەواتەی ئەوەی بانگەشەی ئینتیمای نیشتمانی دەکات، پێویستە تەنها بـە دروشـم خـۆی نەخەڵەتێنیێ، بەڵکو لەسەریەتی بە کردار هەوڵ بۆ ئـەو مەبەسـتە بـداتو، کـارو خێـرو بێـرو هاوکاریو ئامادەیی پێشکەش بکات.

## بڕگەی دووەم: کۆمەلایەتی بوونو گیانی هەماهەنگی

مرۆڤ خۆی کائنێکی کۆمەلایەتیەو ناتوانێ بێ ئەوانی دیکـە بەرژەوەندیـەکانی دەسـتەبەر بکاو ژیان بباتە سەر، لەبەر ئەوە گیانی کۆمەلایەتیبوونو هەماهەنگی نێو تاکەکان، هانـدەرو ئامرازێکە بۆ کۆکردنەوەی وزەو توانای مرۆڤەکانو خـەرج کردنـەوەی لـە پێنـاو بەرژەوەنـدی گشتیو بەڕێوەبردنو پاراستنو پارێزگاری نیشتمانەوە، یەکێ لە سیماکانی هەسـتی نیشـتمانی ئەوەیە رۆڵەکانی بەو پەڕی دڵسۆزیو ئەمانەتەوە ئـەرکی سـەر شـانیان راپـەڕێنن، کـە ئەمـە فاکتەری دروستبوونی هێڵی گشتیە سەبارەت بە مافە نیشتمانیەکان.

کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێـت) دەسـتی کـردە یەکـەمین کـار لـە گۆڕەپـانی مەدینەو برایەتی لە نێوان ئەنسارو موهاجیرەکان دروست کرد، مەبەست ئەوە بوو لە رێی ئەو برایەتیە وزەیەکی مرۆیی کۆمەلایەتی دروست بکاو سازانی دینو نیشتمانی لێ بەرهەم بێت.!

بۆیە گیانی هاوکاریو هەماهەنگبوون خەسڵەتو بنەمایەکی گرنگە بۆ سازاندنی زەمینەی دەستەبەربوونی مافی نیشتمانو دروست کردنی هزرو ئینتیمای نیشتمانی لەناخی تاکەکانەوە.

## بڕگەی سێیەم: ئەنجامدان و گرتنەبەری کارو ڕێی خێر

خۆشەویستی نیشتمان بەشێکە لە ئیمان، بەهەمان شێوە کارو کردەوەی چاکیش بەشێکە لە ئیمان، خوای گەورە ئەرکی ئاوەدانی پێشوەچوونی نیشتمانی بە مرۆڤ سپاردووە، پێشکەوتنی نیشتمانیش بێ پێشکەش کردنی هەنگاوی خێرو بەرنامەی ڕێك و پێك و سیستەم و ستراتیژ بەڕێوە ناچێ، لەبەر ئەوە خوای گەورە تەکلیفی ئەوە دەکا مرۆڤ هەوڵی کارو کردەوەی باش و بە سوود بدات، بۆ ئەوەی سەرئجام کۆی ئەو کارنامە چاکانە ببنە مایەی شکۆمەندی و سەلامەتی و خێر بۆ کۆی دانیشتوانی نێو نیشتمانەوە.

یەکێ لەو مافە نیشتمانیانەی پێویستە هەمووان ڕەچاوی بکەن، ئەوەیە کە مرۆڤ هەنگاوەکانی بە ئاراستەی ڕێکی و ئاسۆیەکانی بەرەو باشی بەرێت، لەو ڕوانگەوە ئەرکمان لەسەر شانە و کۆششی هەموانیش جێی ستایش و پێزانینە، چونکە ئیسلام هانی مرۆڤ دەدات هەوڵەکانی لە چواچێوەی خێرو باشە چڕ کاتەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)[1]، واتە: ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کرد بێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لەکاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.

کەواتە بەو پێیەی لەسەر ئەم خاکە دەژین و ژیان لەو نیشتمانە دەبەینە سەر، ئەرکە ڕێز لەبەهای ئەو نیعمەتە بگرین و بەجوانیەوە مامەڵە بنوێنین، وە چی لە بەرژەوەندی کیان و ژیان و نیشتمان بێت ئەنجامی بدەین، هەرچیەکیش بە زیان بەسەر نیشتمانەوە بشکێتەوە لێی دوور کەوینەوە و خەڵکیشی لێ بە ئاگا بێنین، چونکە سەرەنجام ئەو هەنگاوە کاریگەری ئەرێنی

---

[1] - النحل: ٩٧

لەسەر رەوشی ئەمنیەت و پارێزگاری نیشتمان دەبێت، لەپاڵ ئەمەشدا دەبێ خۆ بەدوور بگرین لە ناکۆکی و لێکترازان و دژایەتی و توندو تیژی و کاری تێکدەرو نادروستەوە، کە مەترسی لە سەر رەوشی ئەمنی دروست دەکەن، فاکتەرەکانی پاراستن و پارێزگاری نەتەوەو نیشتمان کزو لاواز دەکەن.

## بڕگەی چوارەم: دیفاعکردن لە کاتی پێویست

مرۆڤی موسڵمان نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ و پارێزگاری کردنیشی وەك بەشێك لە پارێزگاری دین و ژین سەیر دەکا، بۆیە هەرکات نیشتمان کەوتە مەترسییەوە پێویستە گیانی پارێزگاری لای هەمووان دروست ببێ و هەستی بەرگری و پاراستنی سەرو ماڵ و کیان و نیشتمان لەناخی تاکەکان چەکەرە بکات، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزە هێماو ئاماژەی بەوە کردووەو دەفەرموێ: (**أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ**)[1]، واتە: ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە بەسەرهاتی دەستەیەك لە گەورە پیاوانی نەوەی ئیسرائیل لە دوای موسا لەکاتێکدا بە پێغەمبەرەکەی خۆیانیان وت: پاشایەك، سەرکردەیەکمان بۆ دیاری بکە و بینێرە تا لە پێناوی خوادا بجەنگین، پێغەمبەرەکە وتی: باشە" ئەی ئەگەر جەنگتان لەسەر بڕیاردراو خەریك بوو یەخەتان بگرێت و پەشیمان بوونەوەو نەجەنگان؟ (لە وەڵامدا) وتیان: چیمانە کە لە پێناوی خوادا نەجەنگین، لە

---

[1] - البقرة:٢٤٦

کاتێکیشدا ئەوەتە دەربەدەرکراوین و لە ماڵو منداڵو ولاتمان بووین، کەچی کاتێك جەنگیان لەسەر بڕیاردرا، تەنها کەمێکیان نەبێت ئەوانی تر هەموویان پشتیان هەڵکردو پەشیمان بوونەوە، خوایش زاناو بەئاگایە بە ستەمکاران.

بە پێی دەرهاوێشتەو راڤەی چەمكو دەلالەتی ئەو ئایەتە بێت، جەنگان لە پێناو نیشتمانو وەچەو خزمو خانەوادە هەنگاوێکی گرنگو پێویستە.

زیاتر لەسەر ئەو خاڵە نارۆین چونکە لەوەو پێش بە درێژی باسمان لەو فەرموودەو دەقە شەرعیانە کرد، کە باس لە پیرۆزیو پێویستی گیانی پارێزگاریو بەرگری کردن لە نیشتمان دەکەن.

ئەمانە چەند مافێکی نیشتمانن لەسەر شانی هاونیشتمانیانەوە، بەجێبەجێ کردنیان هۆکاری پاراستنی ئەمنیەتو زەمینەی ئارامیو ئۆقرەیی زیاتر پتەو دەکاو لەرووی واقعیەوە رەنگدانەوەی ئیجابی دەنێتەوە.

❊❊❊

(( الحَمْدُ للهِ أوَّلاً وآخِراً ))

❊❊❊❊❊❊

# پوختەی باس و کۆتایی

دوای تەواوبوونی ئەو نووسینەو خستنە رووی چەند لایەنێکی گرنگ لە بایەخی ئیسلام لەمەڕ پرسی ئەمن و ئاسایش، دیاری کردنی چەند رێنمایی و هۆکارو رێکارێکی پێویست، بۆ دەستەبەر بوون و بەرقەرار کردنی پرسی ئەمنیەتی نەتەوەو نیشتمان، بەو دەرەنجامەی خوارەوە گەیشتین:

١_ هەبوونی ئەمن و ئاسایش لەناو ژیان و کۆمەڵگە نیعمەتی خوای پەروەردگارە، ئیسلام وەك دوایین ئاینی سەرچاوەیەکی گرنگ و گەورەی ئەمن و ئارامیە، چونکە دەستەبەرکردنی ئەمنیەتی بۆ هەموو خەڵکی بە یەکێ لە ئامانجە بنەڕەتیەکانی شەریعەت ناساندووە، هەروەك زەوتکردنی ئاسایشی خەڵکیشی بە تاوان داناوەو، سزای توندیشی بۆ دیاریکردووە.

٢_ ئەمن و ئیمان، ئاشتی و ئیسلام، تەواوکەرو هاوتای یەکن، ئەوەی بیەوێ بە ئارامی و ئاشتی ژیان بەسەر بەرێت، گرنگە پابەندی ئیمان و ئیسلام بێت و، پاراستنی ئەمنیەتیش بە بەشێك لە خواپەرستی و ئەرکی دینداراەنەی خۆی بزانێت، چونکە ئاسایش لە بنەڕەتدا لە ئیمانەوە هاتووەو بەهەموو بەشەکانیەوە داخوازی و داوایەکی شەرعیە.

٣_ مەسەلەی ئەمن و ئاسایش لە چوارچێوەی ئیسلامدا، هەڵقوڵاوی دەرەنجامی ئەو ئیمانەیە کە لەسەر دەستی ئیماندار بۆ کۆمەڵگە بەرهەم دێت، پاراستنی ئەو ئەمن و ئارامیەش هۆکارە بۆ پێشوەچوونی شارستانیەت و گەشەکردنی کۆمەڵگە لەبواری رۆشنبیری و زانستی و ئابووری و فەرهەنگی و ئەخلاقی، سەرەنجام ئەوەش گرنگترین پاڵنەرن، کە دەبنە زامنی مانەوەو بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایش و ئارامی لە ولاتدا.

٤_ پێویستە موسڵمانان رۆڵی دیاریان هەبێت لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاسایش بەهەموو جۆرەکانیەوە، بەو حوکمەی کە ئەم ئەرکە درێژە پێدەری رێبازی راستەقینەی پێغەمبەری

ئیسلامە، دیاریشە کـە جێبـەجێ کردنـی بنـەما شـەرعی و پرنسـیپە ئایینیـەکان لایـەنێکی سەرەکی و فاکتەرێکی بەهێزە لە زامن کردنی ئاسایشی نەتەوەیی.

٥_ یەکێ لە مەهام و کاری پێغەمبەران کـارکردن بـووە بـۆ مەسـەلەی ئـەمن، بەڵگـەش لەسەر ئەو راستیە نزای پێغەمبەر ئیبراهیمە (سەلامی خوای لەسەر بێت)، لەگەڵ بوونی دەیان فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزمان (درودی خوای لەسەر بێت)، کە بـاس لـە گرنگـی و بایـەخی ئەمن و ئارامی نەتەوە و نیشتمان دەکەن و هانی موسڵمانانیش دەدات لەمەڕ ئەو پرسـە خۆیـان بە خەمخۆر بزانن.

٦_ دەستەبەربوونی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی، دەخـوازێ تێکـڕای هۆکـارو رێکـارو هەنگاوە پێویستەکان بگیرێنە بەر، بۆ پاراستن و پارێزگاری لایەنی ماددی و مەعنەوی تاکەکان، لەوەشدا پێویستە رەچاوی دادگەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی و رەخساندنی هەلی کـارو فەراهـەم کردنی هۆیەکانی گوزەران و ژیان بکرێت، کە رۆڵیان لەو پرسەدا گرنگە.

٧_ بەرپرسیارێتی پاراستنی ئەمن و ئاسایش بەتەنها لەئەستۆی هێزەکانی ئەمنی و دەزگـا پەیوەندارەکان نیە، بەڵکو ئەرکی سەر شانی تاک بـەتاکی کۆمەڵگەیـە، ئـەرکی تـاك لـەدام و دەزگاو دامەزراوە حکومی و مەدەنی و رۆشنبیری و ئایینیەکان بەتایبەت لـە مزگـەوت کـورت هەڵنەهاتووە لە ئەدا کردنی کاری خۆی و بەس، بەڵکو دەبێ لەپاڵ ئەرکەکەی هەستی پاراستنی هێمنی و ئارامی بەرامبەر خانەوادە و کۆمەڵگەو کیان و وڵاتی خۆی لەبەرچاو بگرێ و خەمی لێ بخوات.

٨_ دروسـتبوون و دەرکـەوتن و سـەرهەڵدانی هـەر دیـاردە و بزاوێـك، کـە لەگـەڵ کرۆکـی شەریعەت و پێگەی مزگەوت و پەیامی مینبەرو رێـڕەوی زانایـان یـەك ناگرێتـەوە، بـە زیـان و مەترسی بۆ سەر تێکڕای پرۆسەکە دەشکێتەوە و، بـە پلـەی یەکـەمیش دەزگـا مەعنیـەکان و وەزارەتی ئەوقاف لێی بەرپرسیار دەبن.

٩_ پابەندی دینداری‌و ئەکتیف کردنی رۆڵی مینبەرو، گەڕانەوە بۆ پەیامی ئیسلام‌و فیقهی ئیسلامی، بەو تێگەیشتە زانستیەو لۆژیکیەی، کە گەورە زانایانی پێشوو چوارچێوەیان بۆ دارِشتووە، هۆکارێکی گرنگە بۆ بەرقەرارکردنی پرسی ئەمن‌و ئاسایشی نەتەوەو نیشتمان.

١٠_ پەیڕەوکردنی پرنسیپی فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپەو، هەبوونی گوێڕایەڵی‌و بەرجستە کردنی هاوسەنگی‌و ئاشتی‌و بیری میانڕەوی‌و، گیانی هاوکاری‌و هەماهەنگ‌و بوون‌و قوڵکردنەوەی چەمك‌و بەها ئەخلاقی‌و ئینسانیەکان‌و، بلاوکردنەوەی هۆشیاری‌و پەروەردەی تەندروست، هۆکاری گرنگن بۆ دەستەبەربوونی ئەمن‌و ئاسایش لەناو کیان‌و کۆمەڵگەدا.

١١_ رێساکانی ئوسولی فیقەو بنەماکانی فیقهی ئیسلامی بکەین، کە زۆرینەی یاساکانی لە بازنەی رەچاوکردنی بەرژەوەندیە باڵاکانی ژیانی مرۆڤ‌و، دانانی چوارچێوە بۆ پاراستن‌و داکۆکی لێ کردنیان دەخولێنەوە، دەگەینە ئەو راستیە کە ئامانجەکە تەنها بۆ دروستبوونی هۆشیاری پێویستە لەمەڕ بنەماکانی شەریعەت، کە هۆکارێکی سەرەکیە بۆ هێنانەدی ئارامی کۆمەڵگەو ئاسایشی نەتەوەیی.

١٢_ جێبەجێ کردنی سیستەمی سزاو تاوان بە یەکێ لە خاڵە سەرەکیەکانی پلانی ئیسلام لەمەڕ پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگە دادەنرێت.

١٣_ هەبوونی هەست‌و سۆزی نەتەوەیی‌و نیشتمانی وێڕای ئەوەی داخوازیەکی شەرعیە، لەهەمان کات پێویستیەکی گرنگی هەر گەلێکە، چونکە بوونی ئەو هەستە کاریگەری زۆرو باش لەسەر مەسەلەی ئەمن‌و بەرەو پێشەوەبردنی ئاسایشی نەتەوەیی‌و نیشتمانی دەبێت، لەوەشدا گرنگە موسڵمانان خۆیان لەسەر ئەو هەستە رابێنن‌و کار لەسەر بلاوکردنەوەو گەشەپێدانی بکەن.

١٤_ کوردستانی خۆمان بەپێی زۆرێك لەو ئاماژانەی خستمانە روو، شوێنێکی پیرۆزو بەپیت‌و بەرەکەتە، خوای گەورە رێزی بۆ داناوە، لەگەڵ نیشتنەوەی کەشتیەکەی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) بە لانکەی دووەمی مرۆڤایەتی هەژمار دەکرێ، کەواتە زۆر

گرنگە خۆمان بـە خـەمخۆرو پـارێزەری ئـەم ماڵـە گەورەیـە (کوردسـتان) بـزانینو، بایـەخ بـە سـەلامـەتی ئەمنو سـەقامـگیری کۆمـەڵایەتی بدەین.

١٥ــ ناکرێ لایەنی دینداری ببێتە مایـەی پەراوێزخسـتنی هەسـتی پارێزگـاری نەتـەوەو نیشتمانو پرسی ئەمنو ئاسایش، بـەڵکو دەبـێ گیـانی ئـایینی لـەناو موسـڵمانان فاکتـەرو هاندەرێکی بەهێز بێت، بۆ بەرقەرار کردنـی ئەمنیـەتو گرنگیـدان بـە پاراسـتنی، وە دەبـێ موسڵمانان ئەو ئەرکە بە بەشێك لە هەستو سۆزی دینداری خۆیان دابنێن.

***

رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ
وصلى الله وسّلم وبارك على سيدنا ونبيّنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين
سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ
وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

******

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبیەکان

١- الإسلام والأمن الاجتماعي: د. محمد عمارة" الطبعة الأولى/ ١٩٩٨، دار الشروق_ القاهرة.

٢- أصول الفقه الاسلامى فى نسيجه الجديد: الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي" طبعة عاشرة/ ٢٠٠٣، من منشورات مكتب التفسير_ أربيل.

٣- أصول الإيمان والإسلام: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي" الجزء الأول/ الطبعة الثانية/٢٠٠٩، دار الفكر_ دمشق.

٤- أصول الدعوة: تأليف الدكتور عبدالكريم زيدان" الطبعة الأولى/٢٠٠١ نشر احسان_ طهران.

٥- أمن البلاد: اعداد عبدالرزاق بن عبد المحسن البدر" الطبعة الأولى/ ٢٠٠٥، المدينة المنورة.

٦- الأمن في الإسلام حاجة إنسانية: مجلة الوعى الاسلامى العدد: ٥٣٢/ ٢٠١٠

٧- البداية والنهاية: تأليف إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي أبو الفداء" دار النشر: مكتبة المعارف_ بيروت.

٨- تهذيب مدارج السالكين: الإمام ابن قيم الجوزية" تحقيق/ حامد أحمد الطاهر: الطبعة الأولى/ ٢٠٠٩، دار الفجر للتراث_ القاهرة.

٩- التأصيل الشرعي للأمن الاجتماعي د. جيهان الطاهر محمد عبد الحليم* بحث منشور على الإنترنيت.

١٠- التفسير المنير فى العقيدة والشريعة والمنهج: أ.د. وهبة الزحيلي" الطبعة التاسعة/ ٢٠٠٧، دار الفكر/ دمشق_ سوريا.

١١- تفسير آيات الأحكام من القرآن: محمد علي الصابوني" الطبعة الأولى/٢٠٠٤، دار الكتب العلمية_ بيروت.

١٢- حقوق الإنسان فى الاسلام: الأستاذ الدكتور محمد الزحيلى" الطبعة الخامسة/ ٢٠٠٨، دار ابن كثير للطباعة والنشر والتوزيع/ دمشق_ بيروت.

١٣- حِكم أحكام القرآن: الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي/ الطبعة الثالثة.

١٤- الجامع الصحيح سنن الترمذي، تأليف: محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي، دار النشر: دار إحياء التراث العربي - بيروت / تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون.

١٥- رجال الفكر والدعوة فى الاسلام: أبو الحسن علي الحسني النّدوي" الطبعة الأولى/ ١٩٩٩، دار ابن كثير/ بيروت_ لبنان.

١٦- سنن ابن ماجه: تأليف: محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي/ دار الفكر _بيروت.

١٧- سنن أبي داود، تأليف: سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني الأزدي، دار النشر: دار الفكر_ تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد.

١٨- السنن الإلهية في الأمم والجماعات والأفراد في الشريعة الاسلامية: تأليف الدكتور عبدالكريم زيدان" الطبعة الأولى/١٩٩٣، دار احسان للنشر والتوزيع/ طهران_ ايران.

١٩- السلام في الإسلام: إعداد جيهان أحمد عثمان حسين" الطبعة الأولى/ ٢٠٠٧.

٢٠- السياسة الشرعية في ضوء نصوص الشريعة ومقاصدها: دكتور يوسف القرضاوي" الطبعة الثالثة/ ٢٠٠٨، مكتبة وهبة/ القاهرة.

٢١- السيرة النبوية: تأليف الدكتور علي محمد الصلابي/الطبعة الثامنة/٢٠٠٨ دار المعرفة: بيروت- لبنان.

٢٢- السيل الجرار المتدفق على حدائق الأزهار: تأليف محمد بن علي بن محمد الشوكاني" تحقيق: محمود إبراهيم زايد، الطبعة الأولى/١٤٠٥، دار الكتب العلمية_ بيروت.

٢٣- الشرطة في النظام الإسلامي د. راغب السرجاني مقالة منشورة على الانترنيت.

٢٤- صحيح البخاري: تأليف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، دار النشر: دار ابن كثير ، اليمامة_ بيروت- ١٤٠٧ _ ١٩٨٧، الطبعة: الثالثة، تحقيق: د. مصطفى ديب البغا.

٢٥- صحيح مسلم، تأليف: مسلم بن الحجاج أبو الحسين القشيري النيسابوري، دار النشر: دار إحياء التراث العربي_ بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٢٦- صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان: تأليف" محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي، الطبعة الثانية/١٩٩٣، دار النشر: مؤسسة الرسالة _ بيروت.

٢٧- ضوابط المصلحة في الشريعة الإسلامية: محمد سعيد رمضان البوطي" الطبعة الثامنة/٢٠١٠، دار الفكر/ دمشق_ سوريا.

٢٨- غياث الأمم في التياث الظلم: لإمام الحرمين الجويني" تحقيق ودراسة: الدكتور مصطفى حليمي، الدكتور فؤاد عبدالمنعم أحمد. الطبعة الأولى/٢٠٠٧، مؤسّسة الريّان/ بيروت_ لبنان.

٢٩- فتح الباري شرح صحيح البخاري: تأليف أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي" تحقيق: محب الدين الخطيب، دار المعرفة_ بيروت.

٣٠- فقه السيرة: تأليف الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي" الطبعة السابعة/١٩٧٧، مكتبة الشرق الجديد_ بغداد.

٣١- فقه السيرة النبوية: الدرس (٥٧) دور المسجد في الإسلام/ لفضيلة الدكتور محمد راتب النابلسي بتاريخ: ٢٠٠٧/٧/٧، موقع موسوعة النابلسي للعلوم الإسلامية.

٣٢- في السياسة الشرعية: الدكتور عبدالمجيد محمد الأقطش" الطبعة الأولى_ ٢٠١٠/ دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة/ عمان_ الأردن.

٣٣- الفقه الاسلامی وأدلته: تأليف الدكتور وهبة الزوحيلي" الطبعة الرابعة/ ١٩٩٧ دار الفكر المعصر: بيروت –لبنان.

٣٤- قصص الأنبياء: تأليف عبدالوهاب النجار" الطبعة الثالثة/ دار إحياء التراث العربي_ سوريا.

٣٥- قضية الأمن فی الواقع الاسلامی: نیاز الشيخ راغب الديكتيی/ الطبعة الأولی ٢٠١٠ _ مطبعة مادرين/ اربيل كوردستان.

٣٦- كيف نحيي رسالة المسجد: تأليف شوقي عبدالله عبّاد" الطبعة الأولى/٢٠١١، الرياض.

٣٧- نظام الشورى نمط التفكير الجماعي في الإسلام: هشام بن عبدالكريم البدراني" الطبعة الأولى/٢٠٠٥، دار الكتاب_ موصل.

٣٨- نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين: المحامي حمد محمد الصمد" الطبعة الأولى/١٩٩٤، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع_ بيروت.

٣٩- النظم الإسلامية دراسة تأريخية: أ.الدكتور فاروق عمر" الدكتورة مليحة رحمة الله" الدكتور مفيد محمد نوری" الطبعة الأولى/١٩٨٧، منشورات دار الحكمة_ بغداد.

٤٠- النظم الاسلامية: الدكتور حسين الحاج حسن" الطبعة الأولى/١٩٨٧، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع/ بيروت_ لبنان.

٤١- النظم السياسية: دكتور ماجد راغب الحلو" الطبعة الأولى/٢٠٠٧، دار الجامعة الجديدة.

٤٢- الوجيز فی أصول الفقه: الدكتور عبدالكريم زيدان: نشر احسان للنشر والتوزيع/ الطبعة الخامسة/ طهران _ ايران ٢٠٠٠.

٤٣- المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية: تأليف الدكتور عبدالكريم زيدان" الطبعة السادسة عشرة/١٩٩٩، مؤسسة الرسالة. بيروت_ لبنان.

٤٤- المقاصد الشرعية وأثرها في الفقه الإسلامی: دكتور محمد عبدالعاطي محمد علي" سنة الطبع/٢٠٠٧، دار الحديث_ القاهرة.

٤٥- مختار الصحاح: تأليف محمد بن ابى بكر بن عبدالقادر الرّازى" الطبعة الأولى/١٩٨٣، دار الرسالة_ كويت.

٤٦- مختصر تفسير ابن كثير: العلامة الأستاذ محمد علي الصابوني" الطبعة الأولى/ دار إحياء التراث العربي: بيروت_ لبنان.

٤٧- معجم روائع الحكمة: الدكتور روحي البعلبكي" الطبعة الثالثة/٢٠٠١، دار العلم للملايين، بيروت_ لبنان.

## سەرچاوە کوردیەکان:

٤٨- ئیسلامو سیاسەت لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت: نوسینی/ ئارام قادر" چاپی یەکەم/٢٠٠٧، کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر_ کوردستان.

٤٩- بەڵێننامەی ئیسلامی: د. عمر عبدالعزیز" چاپی یەکەم/٢٠١٣، ناوەندی راگەیاندنی ئارا_ کوردستان.

٥٠- روناکی (رب العالمین) روونکردنەوەی (منهاج الطالبین) چاپی یەکەم/ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، دانانی عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.

٥١- ژیاننامەی پێغەمبەر: نوسینی عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا چاپی یەکەم/١٩٩٨ چاپخانەو ئۆفسێتی بێسارانی.

٥٢- گۆڤاری پەیامی زانایان: زمانحاڵی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان/ ژمار ٧٦_٧٧ هەولێر_ کوردستان.

٥٣- ناڵـەی دەروون: شـێخ محەمـەدی خـاڵ" چـاپی دووەم/٢٠١١، دەزگـای چـاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس_ هەولێر.
٥٤- ناسـنامەی حزبـە کوردسـتانیەکان: مسـعود عبـدالخالق" چـاپی دووەم/٢٠١٤، کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ هەولێر_ کوردستان.
٥٥_ نوێسازی: گۆڤارێکی هزری وەرزییە کۆڕبەندی هزری ئیسلامی لە کوردستان دەری دەکات.

# ناوەڕۆک

ئەمن و ئاسایش بۆ هەر گەل و وڵاتێک ،نیعمەتێکی گەورەو پێویستیەکی گرنگ و پرسێکی هەستیارە و ، سەرچاوەی ژیان و پێشکەوتن و گەشە کۆمەڵایەتیەکانە ، خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردووە ، وە یەکێ لە مەهام و کارو هەنگاوی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) فەراهەم کردنی ئارامی کیان و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بووە،ئایینی ئیسلام وێرای ئەوەی سەرچاوەیەکی گرنگ وگەورەیە لەهەمان کات پێشکەوتووە لە دانانی سیستەمی گونجاو بۆ هێنانەدی ئەمن و ئارامی ، ئەوەشی بە یەکێ لەئامانجە بنەڕەتیەکانی شەریعەت ئاساندووە،بەدیوێکی تر مەسەلەی ئەمن لە چوارچێوەی ئیسلامدا ، هەڵقوڵاوی دەرئەنجامی ئەو ئیمانەیە کە لەسەر دەستی ئیماندار بۆکۆمەڵگە بەرهەم دێت لەسەر ئەو بنەمایە گەڕانەوە بۆ پەیامی راستەقینەی ئیسلام و فیقهی ئیسلامی بەو تێگەیشتە زانستی و لۆژیکیەی ، کە گەورە زانایانی پێشوو چوارچێوەیان بۆ دارشتووە هۆکارێکی گرنگە بۆبایەخدان و پەرەسەندن و بەرە و پێش بردنی پرسی ئەمن و ئاسایش لەهەر زەمان و زەمینێکدا

ئەو هەنگاوە لە دۆخی ئێستا وا دەخوازێ موسڵمانان بە لەبەرچاوگرتنی فیقهی واقع،ڕۆڵی دیاریان هەبێت لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە ، بەو پێیەی ئەم ئەرکە هەڵقوڵاوی میتۆدی قورئان و ،درێژە پێدەری ڕێبازی راستەقینەی پێغەمبەری ئیسلامە ،لەپاڵ ئەمەش ئەمن وئیمان،ئاشتیو ئیسلام،تەواوکەرو هاوتای یەکن و ، داوایەکی پێویست و داخوازیەکی ڕەواو شەرعیە

لە تێڕوانینی ئیسلامدا هەمووان چ وەک (تاک)چ وەک ( موسڵمان )لەمەڕ ئەو پرسە بەرپرسیارن،چونکە دەستەبەرکردن وپاراستنی ئەمنیەت ئەرکێکی ئیمانیوئینسانی گەورەیە بۆ بە جێگەیاندنی ئەو ئەرکەش پێویستە هەست و هۆشیاری لەناو تاکەکان بە ئەندازەی پێویست بوونی هەبێ

ئەم ((کتێبە)) هەوڵ و هەنگاوێکی گرنگە ، کە لە چوارچێوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە شیکاری ئەو پرسەی کردووەو ،ڕێکارو ڕێنماییوهەڵوێست و هەنگاوی پێویست و پەیوەستی لەمەڕ هۆشیاری زیاتر لەو بارەوە خستۆتە ڕوو

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر